# ١٠
# پرسیار و وەڵام
## لەسەر هەڵەکانی عومرەکاران

لە فەتواکانی زانای پایەبەرز (محمد بن صالح العثيمين) رحمه الله


نووسینی

أحمد ملا فائق سعيد



مكتبة صلاح الدين
للنشر والتوزيع




# ١٠٠

# پرسیار و وەڵام

## لە سەرهەڵەکانی عومرەکاران

ناوی نامیلکە: ١٠٠ پرسیار و وەڵام لەسەر هەڵەکانی عومرەکاران

نووسینی: أحمد ملا فائق سعید

ژمارەی لاپەڕە: ٩١ لاپەڕە

قەبارەی لاپەڕە: ١٢ X ١٧ سم

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی

(٠) ی ساڵی ٢٠١٧ ی زایینی پێدراوە



چاپی یەکەم

١٤٣٩ هـ

مكتبة صلاح الدين
Salahaddin Bookshop

کتێبخانەی صلاح الدین

هەولێر فلکەی شێخ محمود باڵەخانەی سید بهاء الدین

٠٦٦٢٥٤٠٢٧٦

# ١٠٠

# پرسیار و وەڵام

# لەسەر هەڵەکانی عومرەکاران

لە فەتواکانی زانای پایەبەرز (محمد بن صالح العثيمين) رَحِمَهُ ٱللَّهُ

نووسینی

**أحمد ملا فائق سعيد**

مكتبة صلاح الدين
للنشر والتوزيع

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ، نَحْمَدُهُ، وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ، فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٢].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ [النساء: ١].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا﴾ [الأحزاب: ٧٠-٧١].

«أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كَلَامُ اللَّهِ، وَخَيْرَ الْهُدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ»(١).

وَبَعْدُ:

لەپاش نووسینی (چۆنێتی عومرەكردن) لە شێوەی نامیلكەیەكدا، هەست بەوە دەكرا كە پێویستییەكانی ئەو مەراسیم و ڕێگەیە هێشتا وەكوو پێویست پڕ نەبووەتەوە، لەبەر ڕوودانی كۆمەڵە كار و هەڵەیەك بە هۆكاری نەشارەزاییانەوە، یاخود كەمتەرخەمی و نەزانینیانەوە بەسەر جێبەجێكردنی فەرمانە شەرعییەكانی ئەو مەراسیمە عیبادەتییە.

بەڵام لە هەمووی زیاتر شوێنی سەرنج؛ ئەوەبوو كە لەكاتی ڕوودانی ئەو كارانە بەسەریانەوە سەرچاوەیەكی پڕ زانستی و متمانەی شەرعییان دەست نەدەكەوت وەڵامی تەواوی شەرعی لێوە وەرگرن، تا كارەكانیان ڕاست بكەنەوە و لە دوودڵی ڕزگاریان بێت، ئەمەش دەبووە هۆكاری ئەوەی ئەم عیبادەتەیان بە نیوە و ناتەواو و هەندێكجاریش بە هەڵوەشاوەیی ئەنجام بدەن، بەبێ ئەوەی پێی بزانن.

(١) أخرجه مسلم (٨٦٧)، والنسائي في "الكبرى" (١٧٩٩)، وانظر "خطبة الحاجة" للألباني.

بۆیە بە پێویستمان زانی کە سەد پرسیار و وەڵامی زانای ناودار (محمد بن صالح العثيمين) رَحِمَهُ ٱللَّهُ بکەین بە کوردی، تاوەکوو چاورۆشنییەك بێت بۆ موسوڵمانانی عومرەکاری خۆشەویست.

وە هۆکاری هەڵبژاردنی فەتواکانی الشَّيخ (العثيمين) رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە فەتواکانی وەڵامی خەڵك و ڕووداوەکانی ئەم سەردەمەیە، لەگەڵ ناوداری و متمانەی تەواوی موسوڵمانان لەسەر زانست و بەرنامەی پڕ تێر و تەسەلی ئەهلی سوننەیی لەخۆگری ئەم زانا پایە بەرزە.

لەبەر هۆکاری درێژنەبوونەوە لەسەر خوێنەر و زیادنەبوونی قەبارەی نامیلکەکە؛ تەنها وەرگێڕدراوە کوردییەکەیمان نووسیوە، لەگەڵ ژمارەی فەتوا و بەرگ و لاپەڕە و ناوی سەرچاوەکە.

بەو هیوایەی شوێنی ڕەزامەندی پەروەردگار بێت، پاشان سوودمەندی موسوڵمانان و بێبەشنەبوون لە دووعا خێرەکانیان.

اللَّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ وَبَارِكْ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ

أحمد ملا فائق سعيد

٧ / مُحَرَّم / ١٤٣٩ هـ

٢٧ / ٩ / ٢٠١٧ م - الأربعاء

سلێمانی

# لە كاتی پۆشينی ئيحرامدا
# ( الإحرام )

س ١ / ئايا دروستە ئەوەی كە لە ئيحرامدايە خۆی بشوات، ياخود سەر لەناو ئاودا نوقم بكات؟ [1].

ج / دروستە ئيحرام پۆش خۆی بشوات، گەر خۆشۆردنی واجيبشی لەسەر نەبێت، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ: «كَانَ يَغْتَسِلُ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[2]، واتە: خۆی دەشۆرد كاتێك ئيحرامی لەبەردا بوو.

س ٢ / حوكمی كردنی حەرام و ڕێگرييەكانی ئيحرام بە لەبيرچوون و نەزانين چييە؟ [3].

ج / ئەو كارانەی كە حەرام كراوە لەكاتی پۆشينی ئيحرامدا دەبنە چەند بەشێكەوە:

هەندێكی فيديەی نييە، وەكوو ژن مارەكردن و داواكردنی، وە هەندێكی فيديەی سەرتاشينی هەيە، بە هۆكاری زيان و ئازارێكەوە، وە

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٠٧ (٢٢/ ١٢٩).

(٢) رواه البخاري (١٨٤٠)، ومسلم (١٢٠٥)، كِتَابُ الْحَجِّ، بَابُ جَوَازِ غَسْلِ الْمُحْرِمِ بَدَنَهُ وَرَأْسَهُ.

(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٥٩٢ (٢٢/ ١١١).

هەندێکی فیدیەی حوشتر سەربڕینێکە، وە هەندێك فیدیە لە بریتییە، هەریەك لە بوونی ئەم فیدیانە خاوەنەکەی لەم سێ دۆخە بەدەر نییە:

یەکەم: ئەنجامی بدات بە زانین و ویستی خۆی بەبێ هیچ پاساوێك، ئەوا تاوانبارە و دەبێت جۆرێك لە جۆرەکانی یەکێك لەو فیدیانە بدات.

دووەم: ئەنجامی بدات بە زانین و ویستی خۆی، بەڵام فیدیەی لەسەرە، وەکوو سەرتاشین و هەر شتێکی تر لەبەر ئازار و ... .

سێیەم: ئەو حەرامانەی ئیحرام ئەنجام بدات بە لەبیرچوون و نەزانین، یا زۆرلێکراو، ئەوا خاوەنەکەی تاوان و فیدیەی لەسەر نییە.

س ٣ / کردنی ڕێگرییەکان (حەرامەکانی ئیحرام) پاش لەبەرکردنی ئیحرام؟ (١).

ج / گەر هەر قەدەغەکراو و ڕێگرییەکی ئیحرام بکرێت پاش لەبەرکردنی پۆشاکی ئیحرام بەڵام هێشتا نییەتی نەهێناوە؛ ئەوا هیچی لەسەر نییە، ڕەچاوکردنی شەرعی لێرەدا نییەتە، نەك لەبەرکردنی پۆشاکی ئیحرام (بە لەبەرکردنی پۆشاکی ئیحرام ناچێتە ناو مەراسیمی

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٥٩٥ (٢٢/ ١١٧).

عومرە و حەجەوە تا نییەت نەهێنێت).

س٤ / جل و بەرگی ئافرەت لە ئیحرامدا؟ [(١)].

ج/ دەتوانێت هەر جلێك كە بیەوێت لەبەری بكات، بە مەرجێك جل و بەرگێكی ڕازاوە نەبێت، ئیتر گەر ڕەش بێت یان سەوز، یان هەر ڕەنگێكی تر، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰ﴾ [الأحزاب : ٣٣]، واتە: ئافرەتان نەچنە دەرەوە بە خۆڕازاندنەوە و لەخۆدانی بۆنی خۆش، وەكوو سەردەمی نەفامی پێش ئیسلام[(٢)].

س ٥ / پۆشاكی ئیحرامی سپی بۆ ئافرەتان[(٣)].

ج / جل و بەرگی سپی بە جل و بەرگی ڕازاندنەوە دادەنرێت، لەبەرئەوە نابێت ئیحرامیان سپی بێت.

س٦ / ئایا واجبە ئافرەت دەم و چاوی داپۆشێ لە مەناسیكی حەج

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٨٣ (٢٢/ ١٨٢).
(٢) "تفسير السعدي" ص٦٦٣.
(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٨١ (٢٢/ ١٨١).

و عومرەدا؟ [(١)].

ج/ ئەگەر پیاوانی لە چواردەور نەبوو ئەوا دەم و چاوی دەربخات باشتر و سوننەتە، بەڵام ئەگەر پیاوانی نامەحرەم لە چواردەوری بوون؛ ئەوا واجبە دەم و چاوی داپۆشێت، وەکوو (عائشة) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەڵێت: «كَانَ الرُّكْبَانُ يَمُرُّونَ بِنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُحْرِمَاتٌ، فَإِذَا حَاذَوْا بِنَا سَدَلَتْ إِحْدَانَا جِلْبَابَهَا مِنْ رَأْسِهَا عَلَى وَجْهِهَا فَإِذَا جَاوَزُونَا كَشَفْنَاهُ»[(٢)]. ئەگەر پیاوان بەلاماندا تێپەڕ بوونایە دەم و چاومان دادەپۆشی (واتە بەبێ بەکارهێنانی نیقاب)، گەر ئەو پارچە قوماشە بەر دەم و چاو بکەوێت یان نا.

بەڵام نیقاب کە دەم و لووت دادەپۆشێت و بەس چاو بەدەرەوەیە؛ ئەمە بۆ کاتی ئیحرام حەرامە بەکارهێنانی، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لاَ تَتَنَقَّبِ الْمُحْرِمَةُ، وَلاَ تَلْبَسِ الْقُفَّازَيْنِ»[(٣)]. نابێت ئافرەت لە کاتی ئیحرامدا نیقاب بکات، وە ئەمە مانای ئەوە نییە (أن

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٨٦ - ٧٠٢ (٢٢/ ١٨٣).

(٢) رواه أبو داود (١٨٣٣)، وأحمد في "المسند" (٢٤٠٢١)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٩٠٥١)، وحسنه الألباني في الشواهد في كتاب "جلباب المرأة المسلمة" ص١٠٧.

(٣) رواه البخاري (١٨٣٨)، وأبو داود (١٨٢٥)، والترمذي (٨٣٣)، والنسائي (٣٦٣٩).

تنهي عن ستر الوجه) ڕێگری لە داپۆشینی دەم و چاوی کردبێت، لەبەرئەوەی (الانتقاب لباس الوجه) نیقاب کردن پۆشاکی دەم و چاوە.

س٧ / ئایا دروستە بەکارهێنانی (کمامة) دەم و لووت هەڵپێچ؟[1].

ج / کەمامەی دەم و لووت هەڵپێچ دروستە بۆ کاتی پێویست لە کاتی ئیحرامدا.

س٨ / ئایا دروستە گۆڕینی بەرگی ئیحرام؟ [2].

ج / ئەوەی ئیحرامی لەبەرە دەتوانێت ئیحرامەکەی بگۆڕێت بە یەکێکی تر کە دروستە لەبەری بکات، لەمەدا جیاوازی نییە لەنێوان پیاو و ژندا، بەڵام ئەوەی خەڵك گومانی بۆ دەبات ئەگەر یەکێك بە ئیحرامێکەوە نییەتی هێنا؛ دەبێت بەو بەرگەوە بمێنێتەوە تا مەراسیمی عیبادەتەکەی تەواو دەبێت؛ ئەم جۆرە تێگەیشتنە هیچ بنەمایەکی لە سوننەتدا نییە، وە تەنانەت لە وتەی هاوەڵان و زانایانیشدا نییە.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٠٩ (٢٢/ ١٣٠).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٢٥ (٢٢/ ١٤١).

س ٩ / لە میقاتی (السیل الکبیر)ەوە هاتم بۆ مەککە بۆ عومرە، بەڵام ئیحرامم نەپۆشی، پاشان لە مەککەوە گەڕامەوە میقات و ئیحرامم پۆشی و عومرەکەم کرد، ئایا فیدیەم لەسەرە؟ [(١)].

ج / فیدیەت لەسەر نییە، لەبەرئەوەی لەدوای میقاتەوە ئیحرامت نەپۆشیوە، بەڵکوو گەڕاویتەتەوە میقات، گەر لە مەککە ئیحرامت پۆشیبێت، یان پاش میقات، گەر دەرەوەی مەککەش بێت ئەوا دەبێت حەیوانێك سەرببڕیت لە مەککە و بیبەخشیتەوە بەسەر هەژاراندا.

س ١٠ / وشەی (المخیط) دووراو؟ [(٢)].

ج / لە قەدەغەکراوەکانی ئیحرام کە تایبەتە بە پیاوانەوە لەبەرکردنی: «لاَ تَلْبَسُوا القُمُصَ، وَلاَ العَمَائِمَ، وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ، وَلاَ البَرَانِسَ، وَلاَ الخِفَافَ»[(٣)].

کراس و جلی کڵاودار و شەرواڵ و کڵاو و جامانە و خووفە.

ئەم پێنجە زانایان بە وشەی (المخیط) دووراو نازناویان داوە.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٤٢٩ (٢١/ ٣٦٣).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٥٩٣ (٢٢/ ١١٣).

(٣) رواه البخاري (٥٨٠٣)، ومسلم (١١٧٧).

هەنديك لە خەڵكى وا تێگەيشتوون كە هەرشتێك دووراوى پێوەبێت دەيگرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا وانييە، مەبەستى زانايان ئەوەيە كە بەشێوەى لاشەى ئادەميزاد ئيحرامەكە بدوورێت، واتە وەكوو جل و بەرگى لەبەركردن، لەبەرئەوە گەر ئيحرامێكى پينەكراو و لێكدراو بەيەكەوە لەبەربكات هيچ سەرپێچييەكى تێدا نييە.

## وشەى (المخيط) دووراو:

ج/ وشەى (المخيط) دووراو لەسەر زمانى پێغەمبەر ﷺ و چوار خەليفە و هاوەڵان ﭫ نەهاتووە، يەكەم كەسێك كە ئەم وشەيەى بەكارهێنا (إبراهيم النخعي) ﭬ بوو، كە يەكێكە لە زانايانى (تابعين)، سەيركە ئەم وشەيە چەند ئاڵۆزى لەنێوان خەڵكدا دروست كردووە[1].

## وشەى (المخيط) دووراو:

ج/ بەڵام پێغەمبەرى خوا ﷺ بە گەلەكەى نەوتووە (لا تلبسوا المخيط) لەبەركراوى دووراو لەبەر مەكەن، بەڵكوو پرسيارى لێكراوە كەسى ئيحرام پۆش چى لەبەركات؟ فەرموويەتى: «لاَ تَلْبَسُوا

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦١٥ (٢٢/ ١٣٥).

القُمُصَ، وَلاَ العَمَائِمَ، وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ، وَلاَ البَرَانِسَ، وَلاَ الخِفَافَ».

نابێت كراس و شەرواڵ و لەپێكراوەكان و عەمامە و جامانە و خووف لەبەركات، باسی وشەی (المخيط) دووراوی نەكردووە بە هیچ شێوەیەك، پێویستە لە دەقەكان تێبگەین لەسەر مەبەستی خاوەنەكەی[1].

س ١١ / كەسێك (معوق أو مشلول) لاشەی شەلەلی هەیە و ناتەواوە و ناتوانێت ئیحرام لەبەربكات؟[2].

ج / بەڵێ دەتوانێت ئیحرام نەپۆشێت و عومرەكەی بكات و لە فیدیەیدا حەیوانێك سەرببڕێت، یاخود خواردنی شەش هەژار بدات، یاخود سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت.

بەم شێوەیە زانایان بڕیاریان لەسەر داوە (قیاس) لەسەر سەرتاشین ﴿وَلَا تَحۡلِقُواْ رُءُوسَكُمۡ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡهَدۡيُ مَحِلَّهُۥۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ بِهِۦٓ أَذٗى مِّن رَّأۡسِهِۦ فَفِدۡيَةٞ مِّن صِيَامٍ أَوۡ صَدَقَةٍ أَوۡ نُسُكٖ﴾ [البَقَرَة : ١٩٦].

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٢٣ (٢٢/ ١٤٠).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٢١ (٢٢/ ١٣٨).

س ١٢ / ئايا دروستە پشتێنی (طبـي) لـە تەوافدا، كە هەندێك بەبێ ئەوە ناتوانن بڕۆن، لەگەڵ ئەوەشدا دووراوی پێوەیە؟ (١).

ج / بەڵێ دروستە گەر دووراویشی پێوە بێت، دووراو مەبەست پێی دوورینەوە نییە، بەڵكوو بەرگی دووراوی لەبەركردبێت.

س ١٣ / گەر كەسێك بە جل و بەرگی خۆیەوە هاتە ناو مەككەوە بە نییەتی حەج كردن، پاشان لەناو مەككەدا ئیحرام بپۆشێت لەبەرئەوەی دەسەڵات پێی نەزانێت؟ (٢).

ج / حەجەكەی دروستە، بەڵام كارەكەی حەرامە لە دوو ڕووەوە:

یەكەم: سنووری خوای بەزاندووە، بە لەبەرنەكردنی ئیحرام لە میقاتەوە.

دووەم: فەرمانشكاندنی دەسەڵاتداران، كە فەرمانمان پێدراوە بە گوێڕایەڵییان، لە تاواندا نەبێت.

ئەوا پێویستە تەوبە و داوای لێخۆشبوون لە خوا بكات و حەیوانێك سەرببڕێت لە مەككەدا و بیبەخشێتەوە بەسەر هەژاراندا،

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٢٣ (٢٢/ ١٤٠).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٢٤ (٢٢/ ١٤٠).

لەبەر نەکردنی واجبێك لە واجبەکانی حەج و عومرە، کە پۆشینی ئیحرامە.

س ١٤ / دروستە کەسێك لە ئیحرامدایە خۆی بشوات و ئیحرامەکەی بگۆڕێت بە ئیحرامێکی تر؟ (١).

ج / بەڵێ دروستە خۆی بشوات بۆ پاك و خاوێنی، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ: «كَانَ يَغْتَسِلُ وَهُوَ مُحْرِمٌ»(٢). خۆی شۆردووە پاش ئەوەی ئیحرامی لەبەرکردووە، وە دروستە ئیحرامەکەی بگۆڕێت بە ئیحرامێکی تر.

س ١٥ / حوکمی نەعلێك چییە دووڕینی پێوەبێت؟ (٣).

ج / زانایان مەبەستیان بە دووراو (المخيط) دوورین پێوەبوون نییە، ئەوەی دوورینەوەی پێوەبێت دروستە، وەکوو نەعل و ... بەڵام خووف دروست نییە.

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٣٠ (٢٢/ ١٤٤).

(٢) رواه البخاري (١٨٤٠)، ومسلم (١٢٠٥)، كِتَابُ الْحَجِّ، بَابُ جَوَازِ غَسْلِ الْمُحْرِمِ بَدَنَهُ وَرَأْسَهُ.

(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٣٣ (٢٢/ ١٤٥).

س١٦/ گەر بە تەيارە هات ئيحرام چۆن ببەستێت؟[١].

ج/ پێويستە لە ماڵەوە خۆی بشوات، پاشان ئيحرام بپۆشێت پێش ئەوەی بگاتە ميقات، لەگەڵ گەيشتە ئاستی ميقات (تلبية) و نييەت بێنێت، دوانەكەوێت، لەبەرئەوەی تەيارە خێرايە، لە دەقەيەكدا ماوەيەكی زۆر دەبڕێت ... گەر بە دوو دەقيقە يان سێ دەقيقە پێش ئاگاداركردنەوە بەسەر گەيشتنی ميقات (نييەت و تلبية) بێنێت باشە.

س١٧/ گەر ئيحرامی لەبيرچوو لە ميقاتەوە تا تەيارەكە تێپەڕ بوو، پاشان بە سەيارە گەڕايەوە بۆ ميقات و ئيحرامی بەست، ئايا دروستە؟[٢].

ج/ بەڵێ دروستە، ياساكە وايە كە دەبێت لەو شوێنەی بە ميقاتدا تێدەپەڕێت ئيحرام ببەستێت، گەر نەيبەست و نييەتی حەج يان عومرەی هەبوو، گەر نەگەڕايەوە بۆ ميقات و لەو شوێنەوە بەستی كە لە ميقات دەرچووە؛ ئەوە دەبێت فيديە بدات، وە گەر گەڕايەوە بۆ ميقات و ئيحرامی لەوێوە بەست؛ ئەوا هيچی لەسەر نييە.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٣٤٤ (٢١/ ٢٩٠).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٣٥٦ (٢١/ ٣٠١).

س ١٨ / ئیحرام بەستن و تەلبییە لە فڕۆکەخانەوە پێش دەرچوون؟[١].

ج / ئەوانەی کە بە فڕۆکە دێن و لە فڕۆکەکەدا پێیان ناڵێن بە کاتی گەیشتنی میقات، هیچیان لەسەر نییە، گەر ئیحرام و نییەت و تەلبییە لە فڕۆکەخانەکەدا بکەن پێش هەستانی تەیارەکە.

س١٩ / ئایا نوێژی تایبەت هەیە بۆ ئیحرام بەستن؟ [٢].

ج / بۆ پۆشینی ئیحرام نوێژی تایبەت نییە، گەر نزیکی کاتی نوێژی فەرز بوو ئەوا باش وایە پاش نوێژی فەرزەکە ئیحرام بپۆشێت، وە گەر خۆی شۆرد و کاتی نوێژی چێشتەنگاو بوو نوێژی کرد، یا سوننەتی دەستنوێژی کرد و پاشان ئیحرامی پۆشی، ئەوە باشە، بەڵام ئەوەی کە نوێژی تایبەت هەبێت بۆ پۆشینی ئیحرام لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەهاتووە.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٤٦٠ (٢١/ ٣٨٧).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٤٧٩ (٢٢/ ١٦).

س ٢٠ / كەسێك پاش پۆشینی ئیحرام بیری چووە جلی ژێرەوەی لابدات؟ [١].

ج / هیچی لەسەر نییە، واتە یەكسەر لایبدات، لەبەرئەوەی لەبیرچوون پاساوی شەرعییە، خوای گەورە ﷻ دەفەرمویێت: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ [البَقَرَة : ٢٨٦].

س ٢١ / حوكمی خۆشۆردن بە سابوونی بۆندار لەكاتی ئیحرام پۆشیندا؟ [٢].

ج / هیچی لەسەر نییە، لەبەرئەوەی بۆنەكەی بە بۆن دانانرێت و بەكارناهێنرێت وەكوو بۆن، بەڵكوو بۆ پاككەرەوەیە.

س ٢٢ / ئایا دروستە پیاو لە كاتی ئیحرامدا دەسكێش لەدەست بكات؟ [٣].

ج / دروست نییە پیاو دەسكێش لەدەست بكات، لەبەرئەوەی

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٣٤ (٢٢/ ١٤٥).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٥٧ (٢٢/ ١٦٠).

(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧١٠ (٢٢/ ٢٠٠).

پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردووە پیاو خووف لەپێ بکات کە داپۆشینی قاچە، وە دەسکێشیش داپۆشینی دەستە.

بۆیە ئافرەت تایبەت کراوە بە لەدەستنەکردنی دەسکێش لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، عادەت وابووە ئافرەت لەدەستی کردووە، پیاو لەدەستی نەکردووە.

## بۆنی خۆش (عطر) بەکارهێنانی لە ئیحرامدا

س ٢٣ / لەپاش لەبەرکردنی ئیحرام بە لەبیرچوون، ئافرەتێك بۆنی خۆشی لەخۆی داوە و چاوی ڕشتووە ؟ [(١)].

ج/ هیچی لەسەر نییە، لەبەرئەوەی لەبیری چووە، بەڵام دەبێت کە پێی زانی یەکسەر بۆنە خۆشەکەی لێبکاتەوە بە شۆردن، بەڵام چاو ڕشتن یەکێك نییە لە حەرامکراوەکانی ئیحرام.

س ٢٤ / حوکمی بەکارهێنانی دەسڕی تەڕی بۆندار (معطر) و مەعجوونی دەم و دان و سابوونی بۆنخۆش لە ئیحرامدا؟ [(٢)].

ج/ دەسڕی تەڕی بۆندار کە بۆنەکەی بە دەستەوە دەلکێت

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٤٢ (٢٢/ ١٥٢).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٤٥، ٦٤٦ (٢٢/ ١٥٥).

دروست نييە، بەڵام ئەگەر دەسڕی وشكی بۆندار بوو، وەكوو بۆنی سێو و نەعنا بۆنی لێدەهات؛ ئەوە دروستە.

وە مەعجوونی دەم و دان و سابوونی بۆنخۆش دروستە، لەبەرئەوەی بۆن نييە، بەڵكوو بۆنێكی پاككەرەوەی پاكە، نەك (عەتر و بۆنەكان بێت).

س ٢٥ / حاجييەك دەست دەدات لە (حجر الأسود، ركن اليماني) و لەو كاتەدا بۆندار كراون؟ [١].

ج / گەر بۆنەكە بلكێت بە دەستەوە حەرامە و دروست نييە، دەبێت زوو بە زوو لێی بكاتەوە و بيشوات.

س ٢٦ / حوكمی ئاوێك گوڵاو و نەعناعی تێكرابێت و بخورێتەوە لە ئيحرامدا؟ [٢].

ج / ئاوی گوڵاو دروست نييە، بەڵام نەعناع دروستە، لەبەرئەوەی بۆنەكەی وەكوو بۆنی سێو و ميوە وايە (بۆنی سرووشتييە).

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٤٧ (٢٢/ ١٥٥).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٤٨ (٢٢/ ١٥٥).

س ٢٧ / دروستە بۆنی خۆش بدرێت لە بەرگی ئیحرام پێش لەبەرکردن و چوونە ناو مەراسیمی حەج و عومرەوە؟ [١].

ج / بۆنی خۆش نادرێت لە ئیحرام، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «لَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ ثَوْبًا مَسَّهُ وَرْسٌ وَلَا زَعْفَرَانٌ»[٢].

ئیحرامپۆش نابێت بەرگێکی بۆندارکراو بە وەرس و زەعفەران لەبەربکات، بەڵام لاشەی خۆی پێش (تلبية) و نیەتی ئیحرام دروستە، بە مەرجێك ئیحرامەکە بۆندار نەکات و پێوەی نەلکێت.

س ٢٨ / کەسێك بە ئیحرامەوە بۆنی عەتر بکات بە نیەتی کڕین؟[٣].

ج / نەزانین و لەبیرچوون هیچی لەسەر نییە، وە هەندێك لە زانایان دەڵێن گەر بۆنی کرد بە نیەتی تاقیکردنەوەی جۆری بۆنەکە هیچی لەسەر نییە، لەبەرئەوەی مەبەستی لەخۆدان و چێژبردنی بۆنەکە نییە.

س ٢٩ / هەندێك لە سەرتاشەکان پێش سەرتاشین جۆرێك لە عەتر

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٥١ (٢٢/ ١٥٧).

(٢) رواه البخاري (١٨٣٨) بَابُ مَا يُنْهَى مِنَ الطِّيبِ لِلْمُحْرِمِ وَالْمُحْرِمَةِ، ومسلم (١١٧٧) كِتَابُ الْحَجِ، بَابُ مَا يُبَاحُ لِلْمُحْرِمِ بِحَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ، وَمَا لَا يُبَاحُ وَبَيَانِ تَحْرِيمِ الطِّيبِ عَلَيْهِ.

(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٥٣ (٢٢/ ١٥٨).

و سابوونی بۆنخۆش دەدەن لە سەر؟ [١].

ج / ئەگەر عەتر بوو نابێت، دەبێت ڕێگری لێبکەیت، بەڵام بەس بۆنێکی ناسك و سادە بوو وەکوو نەعناع ... ئەوە هیچی لەسەر نییە (وە هەروەها شامپۆش).

س ٣٠ / خواردنەوەی قاوەیەك بۆنی زەعفەرانی تێدابێت؟ [٢].

ج / گەر بۆنەکەی مایەوە دروست نییە، بەڵام گەر بە هۆکاری کوڵاندنەوە بۆنەکەی ڕۆیشتبوو ئەوە دروستە.

## نینۆك کردن لە ئیحرامدا
## ( تقليم الأظافر )

س ٣١ / نینۆکم کردووە و نەمزانیوە کە حەرامە [٣].

ج / هیچت لەسەر نییە، لەبەرئەوەی کردووتە و واتزانیوە هیچت لەسەر نییە، ئەوەی هەر کارێکی قەدەغەکراوی ئیحرام بکات بە نەزانین و لەبیرچوون و بەبێ بژاردەی خۆی؛ هیچی لەسەر نییە،

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٥٤، ٦٥٦ (٢٢/ ١٥٨).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٥٨ (٢٢/ ١٥٨).

(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٠٠ (٢٢/ ١٢٢).

جیاوازی نییە لەنێوان موو لێكردنەوە و نینۆك كردن و بۆنی خۆش لەخۆدان و لەبەركردنی جل و بەرگ و بێجگە لەوانە، هەموویان لە یەك ئاستدان، لەبەرئەوەی خوای گەورەش ﷻ دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ [البَقَرَة: ٢٨٦].

واتە: خوایە لێمان نەگریت ئەوەی بە لەبیرچوون و هەڵە دەیكەین.

ئەم دەقە بە شێوەیەكی گشتی ئاماژەی پێدەدات، وە خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ۝٥﴾ [الأحزاب: ٥].

واتە: تاوانبار نابن ئەوەی كە بە هەڵە دەیكەن.

بەڵام ئەوانەی بە بێباكی و دەست ئەنقەست دەیكەن، خوای گەورەش لێبوردە و بەبەزەییە. (ئەمە گشتگیرە بۆ هەموو ڕێگری و حەرامەكانی نوێژ و ڕۆژوو ... ئەوەی بیكات بە نەزانین و لەبیرچوون؛ تاوان و كەفارەتی لەسەر نییە).

س ٣٢/ حوكمی نینۆك كردن چییە لەكاتی ئیحرامدا؟ (١).

ج/ نینۆك كردن نابێت، لەبەرئەوەی بەشێكە لە جوانی و

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٠١ (٢٢/ ١٢٣).

ڕازاندنەوە، لە حەجیشدا دەبێت کەسەکە ئەوەی پێوە دیار نەبێت و (أشعث وأغبر) بێت، واتە تۆزاوی و چلکنی.

زۆری زانایان بە یەکێك لە حەرامکراوەکانی ئیحرام ناویان بردووە و حەرامە و دەڵێن ئەوەی سێ نینۆك زیاتر بکات دەبێت فیدیە بدات.

بەهەرحاڵ نابێت خۆت تووشی ئەم کارانە بکەیت کە لەناو زاناکاندا شوێنی ڕاوبۆچوونی جیاوازە.

## سەر دا پۆشین و قاچ دا پۆشین لە ئیحرامدا

س ٣٣ / ئایا دروستە سەرت داپۆشیت کاتێك کە لە ئیحرامدایت؟[١].

ج/ گەر ئافرەت بێت ئەوە دروستە، بەڵام بۆ پیاوان دروست نییە، نە لەکاتی خەودا، وە نە لەکاتی بەخەبەربووندا، وە گەر خەوتبوو پاشان خەبەری بووەوە بینی سەری داپۆشیوە؛ دەبێت لاییدات، وە هیچی لەسەر نییە، لەبەرئەوەی خەوتوو هیچ حوکمێکی لەسەر نییە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٠٤ (٢٢/ ١٢٨).

يَسْتَيْقِظَ، ...»[1].

س٣٤/ ئايا دروستە ئەوەی كە ئيحرامی لەبەردايە سەری داپۆشێت لەبەر سەرما؟[2].

ج/ نابێت سەر داپۆشرێت، بەڵام گەر ترسی زيانی هەبوو بۆ سەری وەكوو ئازار و برين ...، ئەوا لەكاتی سەرداپۆشيندا دەبێت سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، ياخود خواردنی شەش هەژار بدات، ياخود حەيوانێك سەر ببڕێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾ [البَقَرَة: ١٩٦].

س٣٥/ حوكمی قاچ داپۆشين لەكاتی خەودا؟[3].

ج/ هيچ ڕێگرييەكی لەسەر نييە بۆ پياوان، بێجگە لە سەر داپۆشين نەبێت.

(١) رواه أبو داود (٤٣٩٨)، والترمذي (١٤٢٣)، والنسائي في "الكبرى" (٥٥٩٦)، وابن ماجه (٢٠٤١)، وابن خزيمة في "صحيحه" (١٠٠٣)، وابن حبان في "صحيحه" (١٤٢)، وأحمد في "المسند" (٢٤٦٩٤)، والدارمي في "سننه" (٢٣٤٢)، وصححه الألباني في "المشكاة" (٣٢٨٧).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٠٥ (٢٢/١٢٨).

(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٠٦ (٢٢/١٢٩).

س ٣٦ / ئایا بەتانییەك یان كارتۆنێك یان وەرەقەیەك بخاتە سەر سەری؛ وەكوو سەر داپۆشین وایە؟ [1].

ج/ بەڵێ دەیگرێتەوە، بەڵام گەر ویستی سێبەر بۆ سەری بكات؛ با بەرزی بكاتەوە لـەسەر سەری و پێوەی نەلـكێت (وەكوو چەتر).

س ٣٧ / حوكمی دەرخستنی دەست و قاچ لـە نوێژدا بۆ ئافرەتان؟[2].

ج / هەندێك لـە زانایان بە عەورەتی دادەنێن و دەڵێن دەبێت داپۆشرێت.

وە هەندێك دەڵێن عەورەت نییە، دەركەوتنیان نوێژ بەتاڵ ناكاتەوە.

باشتر وایە خۆی بپارێزێت، دەرنەكەوێت لـە نوێژدا.

## لە پێكردنی گۆرەوی

س ٣٨ / ئایا دروستە ئافرەت یان پیاو گۆرەوی لـە پێ بكات؟ [3].

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٥٩٠ (٢٢/ ١١٠).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٢٠٧ (١٢/ ٢٩٦).

(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧٠٦، ٧١٠ (٢٢/ ١٩٧، ٢٠٠).

ج/ بۆ ئافرەت ڕێگەپێدراوە گۆرەوی لە پێ بكات، بەڵام بۆ پیاوان حەرامە خووف و گۆرەوی ... وە هەروەها دەسكێشیش لە دەست بكات.

## مستیله و ئاڵتوون لەبەركردن لە ئیحرامدا

س ٣٩ / حوكمی لەبەركردنی ئاڵتوون و مستیلە لە ئیحرامدا و ئەگەری دەركەوتنی؟ [١].

ج/ دروستە ئافرەتان كاتی ئیحرام چەندە ئاڵتوون و مستیلە و بازنە بەكاربێنن بەبێ زیادەڕەوی، بە مەرجی داپۆشینی لەكاتی ئامادەبوونی پیاوانی نامەحرەمدا.

## تەوافی كەعبە و ( حجر الأسود والركن اليماني )

س ٤٠ / هەندێك لە خەڵكی بە هۆكاری بازنە دروستكردن بە چواردەوری ئافرەتاندا لەكاتی تەوافدا، پشت و ڕوویان دەكەوێتە ڕووی كەعبەوە؟ [٢].

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧١٣ (٢٢/ ٢٠١).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧٩٧، ٧٩٨ (٢٢/ ٢٨٧).

ج / ته‌واف ده‌بێت لای چه‌پت لـه كه‌عبه بێت، به پێچه‌وانه‌وه ته‌وافه‌كه دروست نییه، مه‌رجی ته‌واف ئه‌وه‌یه كه كه‌عبه بكه‌وێته لای چه‌پته‌وه.

س ٤١ / گه‌ر كه‌سێك چه‌ند ته‌وافێكی كرد و هیلاك بوو لـه‌به‌ر قه‌ره‌باڵغی، ڕۆیشت سه‌عاتێك یان دوو سه‌عات ئیسراحه‌تی كرد و پاشان هاته‌وه ته‌وافه‌كانی تری كرد، ئایا سه‌رلـه‌نوێ بیكاته‌وه یان ته‌واوی بكات؟ [(١)].

ج / ئه‌گه‌ر نێوانیان دوورودرێژ و زۆر بوو، وه‌كوو سه‌عاتێك تا دوو سه‌عات؛ ئه‌وه واجبه سه‌رلـه‌نوێ لـه ته‌وافی یه‌كه‌مه‌وه ده‌ستپێبكاته‌وه، وه گه‌ر كه‌م بوو وه‌كوو نوێژی جه‌ماعه‌ت یان نوێژی جه‌نازه؛ ئه‌وا لـه‌و شوێنه‌وه ده‌ستپێده‌كاته‌وه كه وه‌ستاوه تیایدا، لـه‌به‌رئه‌وه‌ی مه‌رجی ته‌واف و سه‌عی سه‌فا و مه‌روه به‌دواداكردنی ته‌وافه‌كانه به‌بێ پچڕان، كه پێی ده‌وترێت (الموالاة).

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨٠٣، ٨٠٤ (٢٢/ ٢٩٢).

س ٤٢ / ئايا بەلای (حجر الأسود)دا تێپەڕم و (الله أكبر) نەكەم، تەوافەكە بكەمەوە؟ [(١)].

ج / (الله أكبر) كردن لە ئاستی (حجر الأسود) لەكاتی تەوافدا سوننەتە و واجب نییە، گەر بە ئەنقەستیش نەیكەیت تەوافەكەت تەواوە و دروستە.

س ٤٣ / شان ڕووتكردن لە تەوافدا بۆ سێیەم تەوافی سەرەتایە یاخود هەمووی؟ [(٢)].

ج / شان ڕووتكردن بۆ هەر حەوت تەوافەكەیە، وە بۆ سێیەمی سەرەتا هەروەڵەیە، دەبێت هەر حەوت تەوافەكە شانت ڕووت بێت، شان ڕووتكردن لەپێش تەواف و دوای تەوافدا نییە.

شان ڕووتكردن (الاضبطاع) لە یەكەم تەوافی هاتنە ناو مەككەوە دەكرێت، گەر تەوافی عومرە بوو یان تەوافی (قدوم) حەجی (قران، افراد) بوو، بەڵام لە تەوافەكانی تردا ناكرێت.

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨١٥ (٢٢/ ٣٠١).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨١٧، ٨٢٢، ٨٢٧ (٢٢/ ٣٠٣، ٣٠٩، ٣١١).

س ٤٤ / حوکمی تەوافی ڕۆژانە چییە؟ [(١)].

ج / گومان نییە کە تەوافی ڕۆژانە عیبادەتە، خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَطَهِّرۡ بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ٢٦﴾ [الحَجّ : ٢٦].

وە زۆرکردنی سوننەتە، بەڵام ئایا تەواف باشە یان نوێژکردن؟ هەندێك لە زانایان دەڵێن تەواف باشترە، بەتایبەت بۆ کەسانی دەرەوەی مەککە، وە هەندێك دەڵێن نوێژ باشترە، بەڵام ڕای دروست ئەوەیە کامەیان زۆرتر سوودمەندی و ملکەچی و ئاگالێبوونی دڵی تێدایە ئەوەیان لەپێشترە.

س ٤٥ / ئایا سوننەتە بە یەك دەست یان بە هەردوو دەست سەلام لە (حجر الأسود) بکەیت، وە تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژدا؟ [(٢)].

ج / سوننەتە بە یەك دەست سەلام بکەیت، وە دەستیشی لەگەڵدا ماچ ناکرێت و ماچیشی بۆ هەڵنادرێت.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨٣٠ (٢٢/ ٣١٣).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨٢١ (٢٢/ ٣٠٨).

وە نابێت تێپەڕ بیت بە بەردەم نوێژخوێندا لە حەرەم، ئەو فەرموودانەی کە لەم بارەیەوە هاتووە گشتین و تایبەتی تێدا نەکراوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت: «لَوْ يَعْلَمُ المَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ، لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ»(١).

واتە: ئەوەی بزانێت چەند تاوانبار دەبێت کە تێپەڕ دەبێت بە بەردەم نوێژخوێنێکدا؛ ئەوا چل ساڵ بووەستێت باشترە تاوەکوو تێپەڕ بێت.

س٤٦/ ئایا لە کۆتایی تەوافی حەوتەمدا دەبێت سەلام و (الله أکبر) بکرێت لە ئاستی (حجر الأسود)دا؟ (٢).

ج/ لە کۆتایی تەوافی حەوتەمدا سوننەت نییە سەلام و (الله أکبر)، یان دەستلێدانی (حجر الأسود)، لەبەرئەوەی تەواف کۆتایی پێدێت، دەستلێدان، یان سەلام و (الله أکبر) کردن لە (حجر الأسود) بۆ سەرەتای کردنی تەوافە، نەك کۆتاییەکەی.

---

(١) رواه البخاري (٥١٠) بَابُ إِثْمِ المَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي، ومسلم (٥٠٧) بَابُ مَنْعِ المَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي.

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨٤٧ (٢٢/ ٣٣١).

س ٤٧ / ئەگەر نەتتوانی دەست بێنیت بە (الركن اليماني)دا ئایا سەلام و (الله أكبر)ی بۆ دەكرێت؟ [١].

ج / وتنی (الله أكبر) و سەلامكردن بە دەست بۆ (الركن اليماني) هیچ بنەمایەكی نییە، دەستپیاهێنانی سوننەتە.

س ٤٨ / ئەگەر یەكێك لەبیری چوو چەندە تەوافی كرد، یا سەعی كردووە، چی بكات؟ [٢].

ج / ئەگەر نەیزانی شەش یا حەوت تەوافی كردووە، ئەوا گەر گومانی لەسەر یەكێكیان بەهێز بوو؛ ئەوە كاری پێدەكرێت، وە گەر گومانی لەسەر هیچ ژمارەیەكیان یەكلا نەبووەوە ئەوا لەسەر ژمارە كەمەكە كار دەكەیت، وەك گومانی وابێت پێنجەمە یان شەشەم تەوافیەتی یا سەعییەتی، بەبێ ئەوەی بۆی یەكلا بێتەوە، ئەوا پێنجەمەكە هەژمار دەكات و دوو تەوافی تر دوای ئەوە دەكات، وە هەروەها سەعیكردنی نێوان سەفا و مەروەش بەهەمان شێوە.

وە گەر تەوافێكی لەبیر چووە لە حەوت تەوافەكە یا سەعیكردنەكە

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨٥٠ (٢٢/ ٣٣٢).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨٦١، ٨٦٥ (٢٢/ ٣٤٦،٣٤٨).

و نێوانیان زۆر نەكەوت؛ ئەوا تەوافەكەی بۆ زیاد دەكاتەوە، وە گەر نێوانیان زۆر كەوت؛ ئەوا سەرلەنوێ تەوافەكە دەكاتەوە، لەبەرئەوەی بەدواداكردنی تەوافەكان (موالاة) مەرجێكی بەهێزە بۆ عیبادەتەكان، گەرچی هەندێك بە مەرجی دانانێن.

س ٤٩ / لەكاتی نوێژی تەراویح دا تەوافكردن باشە یان نوێژكردن؟[1].

ج / باشتر نوێژی تەراویحە بە جەماعەت لەگەڵ موسوڵمانانندا، تاوەكوو عیبادەتێكی تایبەتی، دەتوانێت دوای نوێژی تەراویح تەواف بكات.

س ٥٠ / دوو ڕكاتەكەی دوای تەواف دەبێت هەر لەپشت (مقام ابراهیم)ەوە بێت؟ [2].

ج / لەپشت (مقام)ەوە باشترە، وە گەر لە هەرشوێنێكی دوورتر بێت و مەجالی ئاسانتر بێت باشترە، گرنگ ئەوەیە (مقام) بخاتە نێوان خۆی و كەعبەوە گەر گونجا، وە گەر نا لە هەرشوێنێكی تر بێت لە

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩١٧ (٢٢/ ٣٩٥).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٢١، ٩٢٨ (٢٢/ ٤٠٦).

حەرەم دروستە، لەبەرئەوەی پاراستنی خودی عیبادەتەكە لەپێشترە تاوەكوو شوێنی عیبادەتەكە.

س ٥١ / هەڵەكانی دوو ڕكاتەكەی دوای تەواف؟ [1].

ج /

یەكەم لە هەڵەكان: خەڵكانێك وا گومان دەبەن كە دەبێت لەدوای (مقام ابراهیم)ەوە بێت، نزیك لێی، كە دەبنە هۆكاری قەرەباڵغی و ئازار بۆ تەوافكاران، ئەوانە مافیان لەویادا نییە، بەڵكوو مافی تەوافكارانە، دەبێتە هۆكاری شەڕ و فیتنە و ئازاری موسوڵمانان، وە دەبێتە هۆكاری ئەوەی تەوافكاران پشت و ڕوو بكەنە كەعبە، كە بۆخۆی تێكدانی مەرجێكی تەوافە، كە دەبێت لای چەپیان لە كەعبە بێت، ئەوەی ئەوە بكات مافی ڕێزی نییە، لەبەرئەوەی ستەمكار و سنوور بەزێنە.

هەڵەی دووەم: هەندێك لە خەڵكی نوێژەكە درێژ دەكەنەوە لە قورئانخوێندن و ڕكوع و سوجدە، ئەمانە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرن ﷺ، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ سوورەتی ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٢٥، ٩٣٠ (٢٢/ ٤١٢).

و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ی تێدا خوێندووه.

هەڵەی سێیەم: خەڵكی دوای ئەم دوو ڕكاتە دەست دەكەن بە دووعاكردنێكی دوور و درێژ، دووعاش دوای ئەم دوو ڕكاتە دروست نییە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ نەیكردووه و بە موسوڵمانانی ڕانەگەیاندووه ... پێچەوانەی سوننەتە.

هەڵەی چوارەم: یەكێكی تر لە بیدعەكان ئەوەیە كە خەڵكانێك دەوەستن لەلای (مقام ابراهیم) و دەست دەكەن بە دووعاكردنێكی دوور و درێژ.

س ٥٢ / ئایا نوێژی فەرز لە بریتی دوو ڕكاتی دوای تەواف دەكەوێت؟ [١].

ج/ ڕای جیاوازی لەسەرە لای زانایان، بەڵام باش وایە دوو ڕكاتی سەربەخۆی بۆ بكات.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٢٤ (٢٢/ ٤٠٩).

## دەستنوێژ بۆ تەواف

س ٥٣ / ئەگەر دەستنوێژ بشكێت لەكاتی تەوافدا حوكمی چییە[١].

ج / شيخ الإسلام (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: ئەگەر دەستنوێژ بشكێت؛ بەردەوام دەبێت لە تەوافكردندا و پێویست نییە، لەبەرئەوەی یەكێك لە مەرجەكانی تەواف دەستنوێژ نییە.

ئەم قسەیەی (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ ڕاست و دروستە، لەبەرئەوەی بەڵگە نییە لەسەر بەمەرجبوونی دەستنوێژ بۆ تەوافكردن.

ئەم ڕایەی (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دروستە و فەتوای پێ دەدەین، بەڵام گومان نییە تەوافكردن بە دەستنوێژەوە چاكترە و لەپێشترە، وە بە دەستنوێژەوە هۆكاری ڕای جیاوازی هیچ لەسەر دروست نەبووە و دەرچوونە لە ڕا جیاوازەكانی نێوان زانایان.

ڕاكەی (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ ئەوەی پیاچوونەوەی بەڵگەكانی بكات، بۆی ڕووندەبێتەوە لە بەهێزی بەڵگەكانی و پەسەندی ڕاكەی.

بەڵام كە تەواف تەواو بوو دەبێت دەستنوێژ بگرێتەوە بۆ دوو

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨٧٦، ٨٨١، ٨٨٢، ٨٨٥، ٨٨٦ (٢٢/ ٣٦١، ٣٦٥).

ڕكاتەكەی دوای تەواف، لەبەرئەوەی دەستنوێژ مەرجە بۆ نوێژ بە كۆدەنگی زانایان.

س ٥٤ / ئایا خوێن دەستنوێژ دەشكێنێت؟ [١].

ج / خوێن بەربوونی برین ئێمە دەڵێین دەستنوێژ ناشكێنێت هەرچەندە زۆر بێت، لەبەر نەبوونی بەڵگەی ڕاست و دروست بۆ شكاندنی، خوێنێك لە پێش و پاش نەیەتە دەرەوە دەستنوێژ ناشكێنێت.

## بینینی كەعبە لەكاتی تەوافدا

س ٥٥ / ئایا مەرجە بینینی كەعبە لەكاتی تەوافدا؟ [٢].

ج / مەرج نییە.

## چوونە ناو مزگەوتی حەرەمی مەككەوە

س ٥٦ / هەڵە هەیە لە چوونە ناو حەرەمی مەككەوە لەلایەن حاجییانەوە؟ [٣].

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨٩١ (٢٢/ ٣٧٠).
(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٦٢ (٢٢/ ٤٣٤).
(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧٩٣ (٢٢/ ٢٨٤).

ج/ بەڵێ.

یەکەم: حاجی و عومرەکاران وا گومان دەبەن کە دەبێت لە دەرگای تایبەتییەوە بچنە حەرەمەوە، هەندێك وا گومان دەبەن کە دەبێت عومرەکار لە دەرگای (عومرە)وە بچێتە ژوورەوە، وە هەندێك دەڵێن دەبێت لە دەرگای (باب السلام)ەوە بچیتە ژوور، لە دەرگاکانی ترەوە تاوانبار دەبێت، یاخود باش نییە (مەکروهە).

دووەم: داهێنانی دووعای تایبەت بۆ چوونە مزگەوتەوە و کاتی بینینی (کەعبە)، بەبێ ئەوەی لە سوننەتدا هاتبێت.

سێیەم: وا گومان دەبەن (تحية المسجد)ی حەرەم تەوافکردنە، واتە هەرکاتێك چووە حەرەمەوە دەبێت تەواف بکات، لەسەر قسەی هەندێك لە زانایان کە دەڵێن (تحية المسجد)ی حەرەم تەوافە.

لە ڕاستیدا وانییە و حەرەم وەکوو هەموو مزگەوتێك وایە، گەر چوویتە ژوورەوە بۆ دانیشتن یان نوێژکردن یان وانەی زانستە شەرعییەکان، بەبێ نیەتی تەواف؛ سوننەت وایە دوو ڕکات نوێژ بکەیت، لەسەر ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِذَا

دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ، فَلاَ يَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ»[(١)]. چوویتە مزگەوت دامەنیشە تاوەکوو دوو ڕکات نوێژ دەکەیت.

بەڵام گەر چوویتە ژوورەوە بۆ تەوافکردن، جا تەوافی عومرە بێت یاخود حەج، یاخود سوننەت، ئەوا تەوافەکە بەر (تحية المسجد) دەکەوێت، گەر دوو ڕکات نوێژی (تحية المسجد)یش نەکەیت، وە بەتایبەت لەدوای تەوافەکەشەوە دوو ڕکات نوێژ هەر دەکەیت، مەبەستی زانایانیش بەم جۆرەیە لە قسەکەیاندا کە دەڵێن (تحية المسجد)ی حەرەم تەوافە.

## تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژخوێندا لە حەرەم

س ٥٧ / ئایا تاوانبار دەبین گەر بە بەردەم نوێژخوێناندا بڕۆین لە حەرەمدا؟ [(٢)].

ج / بەشێوەیەکی گشتی تاوانبار دەبێت گەر بە بەردەم نوێژخوێنێکدا تێپەڕ بێت، جیاوازی نییە لەنێوان مەککە و بێجگە لە مەککەدا.

(١) رواه البخاري (١١٧١) بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّطَوُّعِ مَثْنَى مَثْنَى، ومسلم (٧١٤).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٢٥، ٨٢١ (٢٢/ ٣٣٠).

لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ، لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ»[(١)]. گشتییە، وە هیچ شوێنێکی تێدا تایبەتمەند نەکردووە.

س٥٨ / مەبەست لە (ما بين يديه) لەبەردەم نوێژخوێندا چییە؟ [(٢)].

ج / هەندێك لە زانایان دەڵێن سنووری (سترة) سێ باڵە، واتە نزیکەی مەتر و نیوێك، وە هەندێك دەڵێن کۆتایی شوێنی سوجدەکەیەتی، لەبەرئەوەی لە نوێژدا هەر ئەوەندەی پێویستە، ئەم ڕایە بەهێز و ڕاستە لای من، واتە ئەگەر نوێژخوێن (سترة)ی نەبوو لەپێش نوێژەکەی (ئەوا تا شوێنی سوجدەکەی "سترة" یە).

---

(١) رواه البخاري (٥١٠) بَابُ إِثْمِ الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي، ومسلم (٥٠٧) بَابُ مَنْعِ الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي.

ڕوونکردنەوەیەکی شێخ (ابن باز) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت: بەڵام ئەوەی ڕوو دەدات لە حەرەمی مەککە (تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژخوێندا) ئەوە عەفووە لای زانایان، لەبەرئەوەی لە حەرەم توانای خۆپاراستن نییە، لەبەر قەرەباڵغی، بەتایبەت لەکاتی حەجدا، ئەمە بەتایبەت دەگیرێت لە گشتی فەرموودەکەدا، کەواتە لە کاتی زۆر پێویستدا نەبێت هەر بە حەرامی دەمێنێتەوە. "مجموع فتاوى ابن باز" (٢٥/ ١٥٢).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦١٤ (٢٢/ ٣٢١).

## سەعی نێوان سەفا و مەروە

س ٥٩ / حوكمی دەست هەڵبڕین لەكاتی (الله أكبر) كردنی سەر سەفا؟ [1].

ج / ئەوانەی هەردوو دەستیان هەڵدەبڕن وەكوو دابەستنی نوێژ لەسەر سەفا، هیچ بنەمایەكی شەرعی نییە، وە هەمان شێوەش دەكەن بەرامبە (حجر الأسود)، بەڵكوو بۆ سەر سەفا دەبێت دەستهەڵبڕینیان وەكوو دەستهەڵبڕینی دووعاكردن بێت، وە لە بەرامبەر (حجر الأسود) و تێپەڕین پیایدا دەبێت بە یەك دەست بێت، ئەویش دەستی ڕاست بێت.

س ٦٠ / كەسێك سەعی سەفا و مەروە دەكات پێش تەواف، وە لە مەروەوە دەستپێدەكات پێش سەفا؟ [2].

ج / سەعی نێوان سەفا و مەروەكەی دروست نییە، دەبێت دوای تەواف بیكاتەوە، لەبەرئەوەی لە شوێنی خۆیدا نییە.

دەستپێكردن لە مەروەوە بۆ سەفا بەتاڵە، دەبێت بیكاتەوە.

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٦٦ (٢٢/ ٤٣٦).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨٢٩ (٢٢/ ٣١٣).

س ٦١ / نێوانخستنی نێوان تەواف و سەعی نێوان سەفا و مەروە چەندە؟ [(١)].

ج / نێوانخستنی تەواف و سەعی کاتی دیاریکراوی نییە، (موالاة) بەدواداکردنی (نێوان نەخستن) تەواف و سەعی مەرج نییە، گومانمان نییە کە باشترە (واتە نێوانخستنی تێنەکەوێت)، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ تەوافی کردووە پاش ئەوەش سەعی سەفا و مەروەی کردووە، کەواتە سوننەتە و واجب نییە.

س ٦٢ / ئەگەر عومرەکار سەعی سەفا و مەروەی پێشخست بەسەر تەوافی کەعبەدا، چی لەسەرە؟ [(٢)].

ج / گەر سەعی پێشخست و پاشان تەوافی کەعبەی کرد؛ ئەوە بەس سەعی سەفا و مەروە دەکاتەوە، لەبەرئەوەی (ترتیب) بەدوای یەکداکردن واجبە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ بەدوای یەکدا کردوویەتی و فەرموویەتی: «لِتَأْخُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ»[(٣)]. کارەکانی

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٤٠ (٢٢/ ٤٢١).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٤٢، ٩٤٣ (٢٢/ ٤٢٢).

(٣) رواه مسلم (١٢٩٧)، وأبو داود (١٩٧٠)، وأحمد في "المسند" (١٤٤١٩).

حەج و عومرە لە منەوە وەرگرن، بەڵام پێشخستنی لە حەجدا دروستە.

س ٦٣ / ئایا سەعی لە سەفاوە بۆ مەروە، وە لە مەرووەوە بۆ سەفا یەكێكە یان دووان؟ [١].

ج / سەعی لە سەفاوە بۆ مەروە یەك سەعییە و لە مەرووەشەوە بۆ سەفا سەعی دووەمە، بەم شێوە دڵنیاییە لە كاری پێغەمبەر ﷺ و كۆدەنگی موسوڵمانانی لەسەرە.

س ٦٤ / ئایا هەندێك لە تەوافی نێوان سەعییەكانی سەفا و مەروە بە پێ بێت و هەندێكیشی بە عەرەبانە بێت دروستە؟ [٢].

ج / بەڵێ دروستە، لەبەرئەوەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بە سواری حوشتر تەوافی كردووە.

س ٦٥ / ئەگەر بووەستیت لە هەندێك تەوافی سەعی سەفا و مەروە بۆ پشوودان و پاشان دەستپێبكەیتەوە دروستە؟[٣].

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٤٦ (٢٢/ ٤٢٤).
(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٥١ (٢٢/ ٤٢٨).
(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٥٢ (٢٢/ ٤٢٨).

ج/ بەڵێ دروستە بڕواتە دەریشەوە بۆ پێویستی و دەستنوێژ، یاخود ئاو خواردنەوە.

س ٦٦/ لەبەر قەرەباڵغی سەعی یەكەمی نێوان سەفا و مەروەی لە قاتی یەكەم تەواو كردووە و پاشان چووەتە قاتی سەرەوە، ئایا یەكەم سەعی بەتاڵە؟[(١)].

ج/ بەتاڵ نییە و لە دووەم سەعییەوە دەستپێدەكاتەوە، لەبەرئەوەی شوێنەكان شوێنی سەعی نێوان سەفا و مەروەن، نێوانیشی زۆر ناكەوێت.

س ٦٧/ كەسێك نەتوانێت بچێتە سەر سەفا، سنووری دیاریكراوی كوێیە؟ [(٢)].

ج/ سنووری دیاریكراوی نێوان سەفا و مەروە كە واجب بێت سنووری كۆتایی ڕێگەی عەرەبانەكانە، وە گەر مەترێك بچێتە پێشتر ئەوا سەعییەكەی تەواوە.

وە ئافرەتیش هەروەلەی سێ تەوافی یەكەمی كەعبە و نێوان سەفا و

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٥٥ (٢٢/ ٤٢٩).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٦٧، ٩٦٩ (٢٢/ ٤٣٧، ٤٣٨).

مەروەی لەسەر نییە.

س ٦٨/ هەڵەکانی سەفا و مەروە؟ [(١)].

ج/ یەکەم: نیەتهێنان بۆی (نیەتمە حەوت تەوافی ...).

دووەم: دەستهەڵبڕین وەکوو دەستهەڵبڕینی (الله أکبر)ی نوێژ.

سێیەم: هەروەلە نەکردن لەنێوانیاندا.

چوارەم: وتنی ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ ... ﴾ [البَقَرَة : ١٥٨]. لەسەر مەروە، یاخود هەموو جار لەسەر سەفا.

پێنجەم: تایبەتکردنی هەموو سەعییەك بە دووعایەکی تایبەت.

شەشەم: دەستپێکردن لە مەروەوە.

حەوتەم: دانانی سەعییەك لە سەفاوە بۆ سەفا کە دەکاتە (١٤) تەواف.

هەشتەم: تەوافکردنی نێوان سەعی و سەفا و مەروە بەبێ مەراسیمی عومرە و حەج، وەکوو تەوافی کەعبە.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٨٠ (٢٢/ ٤٤٥).

## نوێژ لە مزگەوتەکانی چواردەوری حەرەمدا

س ٦٩ / ئایا پاداشتی نوێژی حەرەم تایبەتە بە حەرەمەوە، یاخود هەموو مزگەوتەکانی حەرەم دەگرێتەوە؟ [(١)].

ج / پاداشتی نوێژ لە (مسجد الحرام)دا تایبەتە بەو مزگەوتەی کە کەعبەی تێدایە و بەس، مزگەوتەکانی سنووری حەرەم نایانگرێتەوە، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «صَلَاةٌ فِيهِ أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ، إِلَّا مَسْجِدَ الْكَعْبَةِ»[(٢)].

ئەمە ڕای بەهێز و دروستە، بە گشتی (مسجد الحرام) ئەو مزگەوتەیە کە کەعبەی تێدا بێت، خوای گەورە عَزَّوَجَلَّ دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُقَٰتِلُوهُمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ [البَقَرَة: ١٩١]، ﴿وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ [التَّوبَة: ١٩]، ﴿فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ﴾ [التَّوبَة: ٢٨].

وە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: «لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ: المَسْجِدِ الحَرَامِ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ،

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال، (٢٠/ ١٦٣)، (١٢/ ٣٩٥).

(٢) رواه مسلم (١٣٩٦) كتاب الحج، باب فضل الصلاة مسجدي مكة والمدينة.

وَمَسْجِدِ الأَقْصَى»[(١)].

گەر ڕێگەی سەفەر بۆ عیبادەت تایبەت بێت بەو مزگەوتەی کە کەعبەی تێدا بێت؛ کەواتە پاداشتی سەد هەزارەکە تایبەتە بەوەوە، گومان نییە نوێژ لە سنووری حەرەمدا خێری زیاترە تا دەرەوەی حەرەم، بەڵام پاداشتی سەد هەزارەکە نایگرێتەوە وەکوو مزگەوتی حەرەم کە کەعبەی تیادایە، ئەم ڕایە بەهێز و تەواوە.

## نوێژی سوننەت لە حەرەمدا

س ٧٠ / ئایا نوێژی سوننەت بکرێت لە حەرەمدا لەبەر پاداشتە زۆرەکەی؟ [(٢)].

ج / کارکردن بە سوننەت لەپێشترە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «أَفْضَلَ الصَّلاَةِ صَلاَةُ المَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا المَكْتُوبَةَ»[(٣)]. باشترین نوێژ لە ماڵەوەیە بێجگە لە فەرزەکان، وە لە پێغەمبەرەوە نەگوازراوەتەوە کە نوێـژە سوننەتەکـانی لە مزگەوت کردبێت، بێجگە لەوانەی کە تایبەتە

---

(١) رواه البخاري (١١٨٩)، ومسلم (١٣٩٧).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨٦٠ (١٤/ ٢٨٨)، (٢٠/ ١٦٧).

(٣) رواه البخاري (٧٣١)، ومسلم (٧٨١). وابن خزيمة في "صحيحه" (١٢٠٤)، وأحمد في "المسند" (٢١٦٢٤).

بە مزگەوتەوە.

بەم بۆنەیەوە ئەمەوێت ئەوە ڕوون بکەمەوە پاداشتە زۆرەکەی نوێژی حەرەم تایبەتە بە مزگەوتێ کە کەعبەی تیادا بێت، ئەمە مزگەوتەکانی مەککە و سنووری حەرەم ناگرێتەوە (ولا تشمل بقية مكة والحرم).

س ٧١ / ئایا نوێژی جەنازە لە حەرەمی مەککەدا پاداشتە زیادەکەی هەیە لەگەڵ پاداشتی قیراتەکەدا؟ (١).

ج / ئەمە شوێنی ڕای جیاوازە لەنێوان زانایاندا، هەندێك دەڵێن بەس نوێژە فەرزەکانە، ئەوانیتر نایانگرێتەوە.

ئەوەی دەردەکەوێت لە فەرموودەکەدا گشتییە، گرتنەوەی هەموویەتی، کەواتە نوێژی جەنازە بە گشتی دەچێتە ناو پاداشتە زۆرەکەی مزگەوتی حەرەمەوە.

س ٧٢ / پاداشتی نوێژ لە حەرەمی مەککەدا ئایا سوننەت و فەرز دەگرێتەوە؟ (٢).

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ١٦٣٠ (٢٤/ ٩١).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" (٢٠/ ١٦٣).

ج / فەرز و سوننەت دەگرێتەوە، هەموو نوێژێك لـە حەرەمی مەككەدا خێرەكەی سەد هەزار نوێژە، بۆ نموونە (تحية المسجد) لـە حەرەمی مەككەدا خێری سەد هەزار (تحية المسجد)ە.

## نوێژی سوننەت بۆ (مسافر) و قورئا نخوێندن و تەراویح و ڕۆژوو لە حەرەمدا

س ٧٣ / چی باشترە بۆ (مسافر) سوننەتی ڕەواتبی پێش و پاشی فەرزەكان و كردنی سوننەت بە گشتی یاخود بەس سوننەتی پێش بەیانی و نوێژی ویتر؟ [١].

ج / (مسافر) باشتر وایە هەموو جۆرەكانی سوننەت بكات، شەونوێژ و نوێژی (ضحى) و (الاستخارة) و هەموو سوننەتەكان، بێجگە لە ڕەواتبی پێش و پاشی نوێژە فەرزەكان نەبێت، بەڵام باقی سوننەتەكان دەتوانێت بكات، گەر كەسێك لـە حەرەمدا نوێژی سوننەتی زۆر كرد؛ هیچ ڕێگرییەك نییە لـەسەری و پێی ناوترێت پێچەوانەی سوننەتە.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٢١ (١٤/٣٥٦).

س ٧٤ / كەسانێك لە دوورەوە دێن بۆ حەرەمی مەككە بۆ (اعتكاف) لە دەی كۆتایی ڕەمەزاندا، بەڵام سوننەتی (الرواتب)ی پێش و پاشی نوێژە فەرزەكان ناكەن؟ [١].

ج / لە ڕاستیدا ئەو كەسەی كە خوای پەروەردگار منەتی خۆی پێبەخشی كە بگاتە ئەم حەرەمە، پێویستە نوێژ زۆر بكات، لە نوێژە دیاریكراوە سوننەتەكان، یاخود لەو نوێژانەی كە دروستە، ئەو كەسەی لەم شوێنە بێت سوننەتی گشتی (النوافل المطلقة) هەیە بۆی، واتە گەر (مسافر) نوێژە ڕەواتیبەكان نەكات، مانای ئەوە نییە بلێین هیچ نوێژ مەكە، بەڵكوو دەڵێین: نوێژ بكە و زۆریشی بكە، نوێژ باشترین شتە، بۆیە ئێمە هانی ئەو برایانەمان دەدەین كە نوێژە سوننەتەكان و نوێژی تریش زۆر بكەن لەم مزگەوتی حەرەمەدا، گەر (مسافر)یش بن، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەفەر ڕێگر نەبوو بۆی لە كردنی نوێژی سوننەت، بەڵكوو نوێژی سوننەتی نیوەڕۆ و مەغریب و عیشای نەدەكرد، بەڵام پاشماوەی سوننەتەكانی تر بە سوننەتی دەمێننەوە، بۆیە لەم بابەتەدا هیچ ئاڵۆزییەك نییە.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" (٢٠/ ١٦٧).

س ٧٥ / نوێژێك لـە حەرەمی مەككەدا سەد هەزارە، ئایا قورئانخوێن هەمان پاداشتی دەستدەكەوێت؟ [1].

ج / ژمارەی پاداشتی نوێژ دڵنیایە، بەڵام قورئانخوێندن و خێر و ڕۆژووگرتن هیچ لـەبارەی پاداشتەكانیەوە نەهاتووە وەكوو ژمارەی دیاریكراو، بەڵام پاداشتی زۆر دەیگرێتەوە لـە خێر و ڕۆژوو و زیكر و خوێندنی قورئان، هەموویان پلـەوپایەی بەرزیان هەیە، بەڵام ژمارەی تایبەتیان لـەسەر نییە.

س ٧٦ / ئایا پاداشتی ڕۆژوو لـە حەرەمی مەككەدا وەكوو پاداشتی نوێژ وایە؟ [2].

ج / وەڵاممان بۆ ئەم پرسیارە دەڵێین: زانایان بنەمایەكی یاساییان هەیە، كە چاكەكردن پاداشتی بەگوێرەی شوێن و كات زیاد دەكات، زانایان بەمە ئەوەیان وەرگرتووە كە ڕۆژوو لـە مەككەدا خێری زیاتر و پلـەوپایەی باشترە تا شوێنی تر، بە هۆكاری بەرێزی شوێنەكەیەوە.

(١) "مجموع فتاوى ابن باز" (٣٠/ ٢٢).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال (٢٠/ ١٦٧).

## ئایا دەتوانرێت زیاد لە (١١) ڕكات نوێژی تەراویح بكرێت ؟

س ٧٧ / نوێژی تەراویح زیاد لە (١١) ڕكات؟ [١].

ج/ وهنا نقول: لا ينبغي لنا أنْ نغلوَ أو نُفَرِّطَ، فبعضُ النَّاس يغلو من حيث التزامُ السُّنَّة في العدد، ... .

پێویستە زیادەڕەوی و كەمڕەوی نەكەین لە سوننەتدا، هەندێك زیادەڕەوی دەكەن لەڕووی ژمارەوە، دەڵێن دروست نییە زیاد لەو ژمارەیەی كە لە سوننەتدایە، دژایەتییەكی زۆر توندی لەسەر دەكەن، دەڵێن تاوانبارن، بێگومان ئەمانە هەڵەن، چۆن تاوانبارن كاتێك پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كراوە دەربارەی شەونوێژ، فەرموویەتی: «مَثْنَى مَثْنَى» دوو دووە.

تایبەتی نەكردووە بە ژمارەیەكەوە، لەبەرئەوەی تایبەتی نەكردووە بە ژمارەیەكەوە كەواتە فراوانی تێدایە ئەم كارە.

بۆ نوێژخوێن هەیە سەد ڕكات بكات و كۆتایی بە ڕكاتێك ویتر بێنێت.

وە ئەو فەرموودەیەش كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «صَلُّوا كَمَا

---

(١) "الشرح الممتع على زاد المستقنع" (٤/ ٥٣).

رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي»[١]، لە چۆنێتیدایە، بەڵام لە ژمارەدا نەخێر، مەگەر دەقێك ژمارەکە دیاری بکات.

کەواتە نابێت توندی کەین لە کارێکدا کە فراوانی تێدایە، تا دەبینین هەندێك لەو برایانە ئیمامەکان بە بیدعەکار ناو دەبەن و لە مزگەوت دەچنە دەرەوە و ئەم پاداشتەیان لەدەست دەردەچێت کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «إِنَّهُ مَنْ قَامَ مَعَ الإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ كُتِبَ لَهُ قِيَامُ لَيْلَةٍ»[٢].

واتە: ئەوەی لەگەڵ ئیمامدا نوێژ بکات تا کۆتایی نوێژەکە؛ پاداشتی نوێژی هەموو شەوەکەی بۆ دەنووسرێت.

وە نوێژ ناکەن و ڕیزەکان دەپچڕێنن، وە ڕەنگە دەستبکەن بە قسەکردن و نوێژ لە خەڵکی تێکبدەن، کە هەموو ئەمانە هەڵەن.

---

(١) رواه البخاري (٦٣١).

(٢) رواه أبو داود (١٣٧٥)، والترمذي (٨٠٦)، والنسائي في (١٣٠٠)، وابن خزيمة (٢٢٠٦)، وابن حبان (٢٥٤٧)، وصححه الألباني في "الإرواء" (٤٤٧)، و"صحيح الجامع الصغير" (٢٤١٧).

## (إعتكاف) له حەرەمدا

س٧٨/ حوكمی (اعتكاف) لەو سێ مزگەوتەدا؟ [(١)].

ج/ (اعتكاف) بێجگە لەو سێ مزگەوتە (حەرەم و مەدینە و قودس) دروستە و تایبەت نییە بەو سیانەوە، ئەمە ڕای مەزهەبی ئیمام (أحمد والشافعي ومالك وأبو حنيفه)يە رَحِمَهُمُ اللَّهُ، وە كە خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ﴾ [البَقَرَة : ١٨٧]. وشەی (مساجد) گشتییە بۆ هەموو مزگەوتەکانی سەر ڕووی دونیا، زۆر دوورە خوای گەورە مەبەستی بە وتەکەی کەمینەیەکی کەم بێت، وە فەرموودەکەی (حذيفة بن اليمان) رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: «لَا اعْتِكَافَ إِلَّا فِي الْمَسَاجِدِ الثَّلَاثَة»[(٢)]. گەر لە ڕەخنە سەلامەت بێت ئەوە مەبەستی (نفي الكمال)ە، واتە (اعتكاف) ی تەواو لەم سێ مزگەوتەدایە، لەبەر ڕێز و پلەوپایەیان بەسەر مزگەوتەکانی تردا.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال، (٢٠/ ١٦١).

(٢) رواه الطحاوي في "شرح مشكل الآثار" (٢٧٧١)، والبيهقي في "السنن الكبرى" (٨٥٧٤)، والبغوي في "شرح السنة" (٦/ ٣٩٤)، وقال الألباني في "الصحيحة" (٢٧٨٦): وهذا إسناد صحيح على شرط الشيخين.

س ٧٩ / چ كاتێك ئەو كەسەی كە (اعتكاف) دەكات دەچێتە (اعتكاف)ەوە و چ كاتێك دێتە دەرەوە لە (١٠)ی كۆتایی ڕەمەزاندا؟[١].

ج / كەسێك كە (اعتكاف) دەكات لەكاتی خۆرئاوابوونی شەوی (٢٠)ی ڕەمەزان دەچێتە (اعتكاف)ەوە، لە بەرئەوەی (١٠)ی كۆتایی ڕەمەزان بە خۆرئاوابوونی شەوی (٢٠)ی ڕەمەزان دەستپێدەكات، وە بە خۆرئاوابوونی شەوی جەژن كۆتایی دێت، وە بە تەواوبوونی ڕەمەزان كەسێك (اعتكاف)ی كردبێت دێتە دەرەوە، وە بە خۆرئاوابوونی شەوی جەژن ڕەمەزان كۆتایی دێت.

س ٨٠ / جۆرەكانی چوونەدەرەوە بۆ كەسێك كە لە ئیعتیكافدا بێت؟ [٢].

ج / چوونەدەرەوەی كەسی ئیعتیكافكار دەبێتە سێ بەشەوە:

بەشی یەكەم: چوونە دەرەوەیەك پێچەوانە و دژایەتی ئیعتیكاف بكات، وەكوو بۆئەوەی بچێتە لای خێزانی یاخود بۆ كڕین و فرۆشتن

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" (٢٠/ ١٧٩).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" (٢٠/ ١٧٤، ١٧٨).

و هاوشێوەی ئەم كارانە بێت كە دژایەتی ئیعتیكاف و پێچەوانەیەتی دەكات، ئەم چوونەدەرەوەیە دروست نییە و بەتاڵكەرەوەی (اعتكاف)ە، ... گەر ئیعتیكافەكە (واجب ونذر) نەبوو، بەڵكوو سوننەت بوو، ئەوا بەو چوونەدەرەوەیە تاوانبار نابێت، بەڵام بەتاڵ دەبێتەوە.

بەشی دووەم: چوونەدەرەوەیەك كە هەر دەبێت ببێت و كارێكی بەردەوامە، وەكوو: چوونەدەرەوەیەك بۆ خواردن، كە كەسێك نەبێت بۆی بێنێت، یاخود بۆ چوونە سەرئاو (خۆشۆردنی لەشگرانی، یاخود خۆشۆردنێك بۆ لابردنی عەرەق و چڵكنییەك كە پێوەی نارِەحەتە، نەك بۆ خۆ فێنككردنەوە)، هاوشێوەی ئەمانە ئەمە بۆی هەیە بچێتە دەرەوە، ... لەبەرئەوەی هەموو كەس دەزانێت پێویستە بۆ چوونەدەرەوەی ئەمانە.

بەشی سێیەم: چوونەدەرەوەیەك پێچەوانەی (اعتكاف) نییە، بەڵام دەكرێت نەكرێت، وەكوو لەگەڵ (جنازە)دا رِۆیشتن و سەردانی نەخۆش و سەردانی كەس و كاری و هاوشێوەكانی كە عیبادەتە، بۆ ئەمە زانایان دەڵێن: گەر بە مەرجی گرتبوو لە سەرەتای (اعتكاف)ەكەدا (واتە لە كاتی نییەتی ئیعتیكاف)دا وتبێتی ئیعتیكاف

دەكەم بە مەرجێك ئەم كارانە هاتە ڕێم ئەنجامی دەدەم؛ ئەوا دەتوانێت بیكات، وە گەر مەرجی دانەنابوو نابێت بیكات.

## عومرەكردن لە ڕەمەزاندا

س ٨١ / ئایا عومرەكردن لە ڕەمەزاندا پەیوەستە بە سەرەتایەوە یان ناوەڕاستی یان كۆتاییەوە؟ [١].

ج / عومرەكردن لە ڕەمەزاندا پەیوەست نییە بە سەرەتا و ناوەڕاست و كۆتاییەكەیەوە، بەڵكو گشتییە بە هەموو مانگەكەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «فَإِنَّ عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ تَقْضِي حَجَّةً أَوْ حَجَّةً مَعِي»[٢]، واتە: عومرەیەك لە ڕەمەزاندا وەكوو حەجێك وایە لەگەڵ مندا، پێغەمبەری خوا ﷺ تایبەتی نەكردووە بە هیچ كاتێكی مانگەكەوە.

س ٨٢ / چەندبارەكردنەوەی عومرە لە ڕەمەزاندا هیچ هەڵەیەكی تێدایە؟ [٣].

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧٦٣، ٧٦٥ (٢٢/ ٢٤٣، ٢٤٧).

(٢) رواه البخاري (١٨٦٣)، وأبو داود (١٩٨٨)، والترمذي (٩٣٩)، وابن ماجه (٢٩٩١).

(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧٦٤ (٢٢/ ٤٤٥).

ج/ بەڵێ هەڵەی تێدایە، لەبەرئەوەی پێچەوانەی کار و کردەوەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیەتی، پێغەمبەر ﷺ لە گرتنەوەی مەککەدا بیست ڕۆژ خۆیی و هاوەڵانی لە مەککە بوون، نە خۆی و نە یەکێك لە هاوەڵانی نەچوون بۆ (تنعیم) لە پێناوی عومرەکردنێکدا، لەگەڵ ئەوەشدا کاتەکە ڕەمەزان بوو.

وە کاتێکیش لە حەجدا ڕێگەی داوە بە (عائشة)ی خێزانی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا کە عومرە بکات لەدوای حەجەکەی؛ هۆکاری نەکردنی عومرەکەی بووە لە سەرەتای حەجیدا، بە هۆکاری سووڕی مانگانەوەی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە (عبد الرحمن)ی برای عومرەی پێکرد، بەڵام (عبد الرحمن) عومرەی نەکردەوە لەگەڵیدا، لەبەر نەبوونی ئەو هۆکارە لەودا.

دووبارەکردنەوەی عومرە (ابن تیمیة) رَحِمَهُ اللَّهُ دەڵێت مەکروهە، بە کۆدەنگی زانایانی پێشین، لە ئیمام (أحمد) رَحِمَهُ اللَّهُ دەگێڕنەوە کە دەڵێت دەبێت قژی بێتەوە ئەوکات عومرەی تر بکات (إذا حمم رأسه)، واتە گەر سەری ڕەش بووەوە، گەر لەنێوان عومرە بۆ عومرەیەکی تر مانگێك بێت، یان هاوشێوەی، ئەوە ڕێگری لێ ناگیرێت و لە دروستی دەرناچێت (إن شاء الله)، بەڵام ئەوەی خەڵکی ئەمڕۆ دەیکات لە کردنەوەی عومرە هەموو ڕۆژێك؛ بیدعە و کارێکی هەڵەیە، هیچ

بنەمایەکی لە کاری هاوەڵان و شوێنکەوتووانیاندا نەبووە، پێغەمبەر ﷺ لە گرتنەوەی مەککەدا (١٩) ڕۆژ و لە (عمرة القضاء)دا سێ ڕۆژ مایەوە لە مەککەدا، لە یەك عومرە زیاتری نەکردووە.

س ٨٣ / ئایا دروستە شەوی (٢٧)ی ڕەمەزان تایبەت بکرێت بە عومرەکردن؟ [(١)].

ج/ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «فَإِنَّ عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ تَقْضِي حَجَّةً أَوْ حَجَّةً مَعِي»، عومرەیەك لە ڕەمەزاندا وەکوو حەجێك وایە، ئەمە سەرەتا و کۆتایی ڕەمەزان دەگرێتەوە، تایبەتکردنی شەوی (٢٧)ی ڕەمەزان بۆ عومرەکردن بیدعەیە، هاوەڵان لە هەموومان کۆششکارتر بوون بۆ خێر، هەوڵی عومرەکردنیان نەداوە لەو شەوەدا، ئەوەی کە لەو شەوەدا پێویست و سوننەتە نوێژکردنە، «مَنْ قَامَ لَيْلَةَ القَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[(٢)]. ئەوەی شەوی قەدر بە شەونوێژ بباتە سەر بە باوەڕ و چاوەڕێی پاداشتەوە؛ هۆکارە بۆ سڕینەوەی تاوانی ڕابوردووی.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧٧٤ (٢٢/ ٢٦٠).

(٢) رواه البخاري (١٩٠١) كِتَابُ الصَّوْمِ: بَابُ مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا وَنِيَّةً، ومسلم (٧٦٠).

## عومرەکردن لە مانگی ڕەجەبدا

س ٨٤ / تایبەتکردنی مانگی (رجب) بۆ عومرەکردن؟ [١].

ج / مانگی (رجب) یەکێکە لە چوار مانگەکەی (محرم)، ... هیچ بەڵگەیەك نابینم لەسەر ئەوەی عومرەکردن لە مانگی (رجب)دا سوننەت بێت، وە هەروەها تایبەتکردنی بە ڕۆژووەوە، بەڵکوو (مکروه)ە، وە ئەوەی دەڵێن (صلاة الرغائب) لە یەکەم شەوی یان هەینی (رجب)دا، ڕاست نییە و هیچ بنەمایەکی نییە.

وە هەروەها ئەو حەیوان سەربڕینەی پێی دەڵێن (عتيرة) لە مانگی (رجب)دا ئەوە سڕاوەتەوە (منسوخ)ە و دروست نییە.

وە هەروەها دەڵێن (الاسراء والمعراج) لە ( ٢٧ ) تێیدا ڕووی داوە، ئەوە بە هیچ شێوەیەك ڕاست نییە.

## سەفەرکردن بە تەیارە و ئیحرام پۆشین

س ٨٥ / زۆر پرسیار دەکرێت لەسەر ئەوەی کە بەرگی ئیحرامیان لەناو جانتاکەدایە و سەفەر بە تەیارە دەکەن و بە میقاتدا تێدەپەڕن،

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧٨٩ (٢٢/ ٢٧٣).

چۆن ئیحرام ببەستن؟ [(١)].

ج / دەتوانن جلی سەرەوە داکەنن، واتە کراس و فانیلەکانیان بپێچن لە خۆیانەوە وەکوو ئیحرام، بە شەرواڵ و پانتۆڵەکانیانەوە بمێننەوە (تلبیە) بکەن تا دادەبەزن و ئیحرامەکانیان لەبەر دەکەن بەبێ دواکەوتن، لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ لَمْ يَجِدْ إِزَارًا فَلْيَلْبَسْ سَرَاوِيلَ»[(٢)]. ئەوەی ئیحرامی دەست ناکەوێت با شەرواڵ و بەرگی خوارەوەی لەبەردا بێت.

س ٨٦ / گەر کەسێك سەفەر بە تەیارە بکات و ئیحرام لەماڵەوە ببەستێت؛ هیچی لەسەرە؟ [(٣)].

ج / هیچی لەسەر نییە گەر ئیحرام لە ماڵەوە بپۆشێت، گەر ویستی سەفەر بە تەیارە بکات، بەڵام گەر نزیکی میقات بووەوە؛ نیەت و (تلبية) بهێنێت.

ج / دەبێت خۆی ئامادە بکات بە خۆشۆردن لە ماڵەوە و پاشان

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٣٩ (٢٢/ ١٤٩).

(٢) رواه البخاري (٥٨٠٤)، ومسلم (١١٧٩).

(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٣٧٥ (٢١/ ٣١٤)، (١٥/ ٢٤٥).

بەرگی ئیحرام بپۆشێت پێش گەیشتن بە (میقات)، لەگەڵ گەیشتنە میقات نیەت و (تلبیة) بهێنێت و دوانەکەوێت، لەبەرئەوەی تەیارە لە ماوەی دەقەیەکدا ماوەیەکی زۆر دەبڕێت[١].

ج/ گەر بە (٥، ١٠) دەقیقە یا سەعات یا دوو سەعات نیەتت هێنا و (تلبیة) ت کرد، پێش گەیشتن بە ئاستی میقات، ئەوا هیچت لەسەر نییە و دروستە، ئەم کارە فراوانی تێدایە، گەر دوای (تلبیة) و نیەت بشخەویت هیچ زیانێکی نییە[٢].

س ٨٧ / گەر یەکێك ئیحرامی لەبیرچوو لەناو تەیارەکەدا بیپۆشێت، تا لە میقات دەرچووە، ئایا بۆی هەیە بگەڕێتەوە میقات؟[٣].

ج/ بەڵێ دروستە گەر لە میقاتەوە دەرچوو بە مەبەستی حەج یا عومرەکردن و ئیحرامی نەبەست، گەر ئیحرام لەو شوێنەوە کە دەرچووە ببەستێت دەبێت حەیوانێك سەر ببڕێت.

وە گەر گەڕایەوە بۆ میقات و ئیحرامی بەست؛ ئەوا هیچی لەسەر نییە، وە گەر ئیحرام لە (جدة)وە ببەستێت دەبێت فیدیە بدات.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٣٤٤ (٢١/ ٢٩٠).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٣٦٦ (٢١/ ٣٠٨).

(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٣٥٦ (٢١/ ٣٠٢).

## حوکمە شەرعییەکانی پەیوەست بە ئافرەتان لە مەراسیمی عومرەدا

س ٨٨ / گەر ئافرەتێك سووڕی مانگانەی بەسەردا هات پێش ئیحرام، یان پاش ئیحرام و کاتی عومرەکەی، چی بکات؟ [(١)].

ج / گەر ئافرەتێك کەوتە سووڕی مانگانەوە پێش ئیحرام و (میقات)، ئەوا دەبێت کە گەیشتە (میقات) ئیحرام بپۆشێت و نییەت بێنێت و (تلبیة) بکات، بەڵام گەر دوای ئیحرام ئەو حاڵەتەی بەسەردا هات، ئەوا:

– گەر پێش تەوافکردن بوو: ئەوا دەبێت چاوەڕێ بکات تا پاك دەبێتەوە، پاشان تەواف و عومرەکە دەکات.

– گەر لەدوای حەوت تەوافەکە کەوتە سووڕی مانگانەوە: ئەوا با سەعی سەفا و مەروە و قژبڕین (واتە عومرەکە تەواو بکات)، سەفا و مەروە ڕێگری لێ ناکرێت بەو هۆکارەوە.

– گەر لە میقاتەوە کەوتە سووڕی مانگانەوە و دوودڵ بوو لەوەی کەس و کاری چاوەڕێی ناکەن تا پاك دەبێتەوە، با داخلی ئیحرام نەبێت، وە گەر وا ڕێکەوت کەس و کاری مانەوە تا دوای

---

(١) "مجموع فتاوی ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٥٧٣، ٥٧٤ (٢٢/ ٩٠).

پاكبوونەوەی، ئەوا دەتوانێت بچێت بۆ (تنعيم)، لەوێوە ئيحرام بپۆشێت و عومرەكەی بكات.

س ٨٩ / حوكمی بەكارهێنانی حەبی ڕێگری منداڵ بۆ مەبەستی عومرە يا حەجكردن بۆئەوەی سووڕی مانگانەی بەسەردا نەيەت؟ [(١)].

ج / بەكارهێنانی حەبی ڕێگری منداڵ بۆ ڕێگری لە سووڕی مانگانە، وای بەباش دەزانم بەكاری نەهێنن، مەگەر پێويستييەكی زۆر ڕووی تێبكات، بەڵام بەكارهێنانی بۆ مەبەستی ئەنجامدانی عومرە و حەج هيچ ڕێگرييەك نييە بۆی، لەبەرئەوەی پێويستييەكی كاتييە.

س ٩٠ / ئافرەت لە سووڕی مانگانەدايە، دەتوانێت لە سەفا و مەروەدا دابنيشێت؟ [(٢)].

ج / دروستە، لەبەرئەوەی سەفا و مەروە لە سنووری حەرەمدا نييە.

س ٩١ / ئافرەتێك لەدوای تەوافی كەعبە و لەكاتی سەعی سەفا و مەروەدا دەكەوێتە سووڕی مانگانەوە؟[(٣)].

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩١٦ (٢٢/ ٣٩٤).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٥٧ (٢٢/ ٤٣٢).

(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٥٩ (٢٢/ ٤٣٣).

ج / هیچی لەسەر نییە و عومرەکەی تەواوە، باقییەکەی تری با تەواو بکات، لەبەرئەوەی سەعی نێوان سەفا و مەروە دەستنوێژ مەرج نییە تیایدا، بەپێچەوانەی تەوافەوە.

وە گەر ڕاستەوخۆ دوای تەواف پێش دوو ڕکاتەکەی پشت (مقام ابراهیم) کەوتە سووڕی مانگانەوە؛ ئەوا عومرەکەی دروستە و هیچی لەسەر نییە.

دوو ڕکاتی دوای تەواف ڕوکن نییە لە حەج و عومرەدا، ئەوەی نەیکات تەوافەکەی ناکاتەوە و سەربڕینی حەیوانی لەسەر نییە.

س ٩٢ / ئایا دروستە ئافرەت لەکاتی سووڕی مانگانەدا بچێتە ناو حەرەمی مەککە؟ (١).

ج / دروست نییە بچێتە ناو حەرەمی مەککە، مەگەر بە تێپەڕبوون بێت، بەڵام مانەوە و گوێلێگرتنی زیکر و تەسبیحات دروست نییە لە حەرەمدا، وە گەر لەکاتی تەوافدا تووشی ئەو حاڵەتە بوو؛ ئەوا دەبێت ڕاستەوخۆ لە حەرەم بچێتە دەرەوە و چاوەڕێی پاکبوونەوە بێت و پاش (غسل)کردنی بۆ سووڕی مانگانەکەی لە تەوافەوە دەستپێدەکاتەوە، عومرەکەی تەواو دەکات بەبێ ئەوەی پێویستی بە ڕۆیشتنەوە بێت بۆ

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٠٠ (٢٢/ ٣٨٢).

(میقات) و ئیحرام بەستنەوە، لەبەرئەوەی لە میقاتەوە هاتووە و لەو کاتەی سووڕی مانگانەی بەسەردا هاتووە لە ئیحرام دەرنەچووە و هەر لە ئیحرامدایە، هەموو حەرامەکانی لەسەر لاناچێت، وەکوو موو لێکردنەوە و بۆنی خۆش لەخۆدان و نزیکبوونەوەی مێرد لێی، بەڵام خۆشۆردن و جل گۆڕین دروستە، بەبێ لەدەستکردنی دەسکێش و (نیقاب) کردن.

س ٩٣ / ئافرەتێك لە سووڕی مانگانەدا بوو، لە میقاتەوە هات، کاتێك گەیشتە حەرەم پێش تەواف پاك بووەوە و عومرەکەی کرد، حوکمی چییە؟ [1].

ج / ئەگەر بە ئیحرامەوە لە میقاتەوە هاتووە ئەوە تەواوە، بەڵام لەبەرئەوەی (غسل) خۆی نەشۆردووە لەدوای تەواوبوونی سووڕی مانگانەکەی؛ تەواف و سەعی ... بەتاڵە، دەبێت تەواف و سەعییەکەی و قژ کورتکردنەوە ئەنجام بدات، ئەوکاتە عومرەکەی تەواوە.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٠٣ (٢٢/ ٣٨٥).

س٩٤/ گەر ئافرەتێك مێردەكەی مردووە، لە ماوەی (عدة) مردنی مێردەكەیدا بوو، یاخود (طلاق)، دەتوانێت حەج بكات؟ [١].

ج/ ئەو ئافرەتەی كە مێردەكەی مردووە و لە (عدة) چوار مانگ و دە ڕۆژەكەیدا بوو، نابێت حەج بكات و سەفەر بكات، دەبێت لەماڵەوە دەرنەچێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ [البَقَرَة : ٢٣٤]. بەڵام (عدة) تەڵاق پێویستە ئیزن لە مێردەكەی وەربگرێت و لەگەڵ مەحرەمدا ئەنجامی بدات.

## نزیكبوونەوە لە خێزان

## چوونە لای خێزان لە پاش ئیحرام پۆشین

س ٩٥/ گەر كەسێك لە ئیحرامدا بێت و بچێتە لای خێزانی، چی لەسەرە؟ [٢].

ج / گەر لە ئیحرامی عومرەكردندا بێت (پێش تەواوبوونی مەراسیمی عومرەكەی، كە كۆتایی بە سەرتاشین یان كورتكردنەوە

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٧ (٢١/ ٦٩).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٦٦٧ – ٦٧٥ (٢٢/ ١٦٧ – ١٧٦).

دێت بۆ هەردوولايان)، دەبێت حەيوانێك سەر ببڕێت لە مەككەدا، يا خواردنی شەش هەژار، يا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بوون، لەگەڵ ئەوەشدا عومرەكەيان هەڵدەوەشێتەوە و دەبێت لە ميقاتەوە ئيحرام ببەستنەوە و سەرلەنوێ عومرەكە بكەنەوە.

وە گەر لە مەراسيمی حەجدا بوون، ئەوا لە دوو حاڵەت بەدەر نييە:

١. لەپێش (التحلل الأول) حەڵاڵبوونی يەكەمدا بوو (واتە لەپێش ڕەجمكردنی "جمرة العقبة" جەمرەی گەورە و سەرتاشين يا كورتكردنەوە) يەكەم ڕۆژی جەژن؛ ئەوا:

يەكەم: تاوانبارە.

دووەم: دەبێت هەموو مەراسيمی حەجەكەی تەواو بكات: ﴿وَأَتِمُّواْ ٱلۡحَجَّ وَٱلۡعُمۡرَةَ لِلَّهِ﴾ [البَقَرَة : ١٩٦].

سێيەم: حەجەكەی بەتاڵە، لە بريتی فەرز و سوننەت ناكەوێت.

چوارەم: دەبێت ساڵی داهاتوو يا هەركاتێكی تر حەجەكەی بكاتەوە، ئەگەر فەرز بوو يان سوننەت.

پێنجەم: دەبێت حوشتر یا مانگا یاخود گوێرەکەیەك سەر ببڕێت لە مەککەدا، وە گەر حەوت مەڕ بوو ئەوا دروستە.

ئاشکرایە (أن الجماع أعظم محظورات الإحرام) گەورەترینی حەرامەکانی کاتی ئیحرامە، خوای پەروەردگار دەفەرمویێت: ﴿فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلۡحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلۡحَجِّ﴾ [البَقَرَة : ١٩٧].

**٢.** لەپاش (التحلل الأول) واتە (لەدوای ڕەجمکردنی جەمرەی گەورە و سەرتاشین یا کورتکردنەوە) بەمانە هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ دەبێت، بێجگە لە ئافرەت نەبێت (واتە بەس تەوافی الإفاضة و سەعی نێوان سەفا و مەروە دەمێنێت)، پاش ئەم دوانە ئافرەتیشی بۆ حەڵاڵ دەبێت و هیچ حەرامێکی کاتی ئیحرامی لەسەر نامێنێت و پێی دەوترێت (التحلل الثاني) حەڵاڵبوونی دووەم، بەس ڕەجمکردنی هەرسێ جەمەراتی سێ ڕۆژەکەی جەژنی قوربانی دەمێنێت، کە هیچ شتێکی لەسەر حەرام نییە ئەو سێ ڕۆژە.

گەر چووە لای خێزانی لەدوای (التحلل الأول) و پێش (التحلل الثاني)، ئەوا:

یەکەم: تاوانبارە.

دووەم: هەڵوەشاندنەوەی ئیحرامەکەیەتی.

سێیەم: دەبێت مەڕێك سەر ببڕێت لە مەککەدا و بیبەخشێتەوە بەسەر هەژاراندا، یاخود خواردنی شەش هەژار، یاخود سێ ڕۆژ بەڕۆژووبوون، یەکێك لەم سیانە ئەنجام بدات، بڕواتەوە بۆ نزیکترین میقات، وەکوو (تنعیم) ئیحرام ببەستنەوە و تەوافی (الإفاضة) و سەعی نێوان سەفا و مەروە بکەن بە ئیحرامەوە.

هەمان حوکمە بۆ ڕوودانی لە عومرەشدا.

ئەم کارە گەر بە دڵنیایی؛ نەزان بوون بەسەر حەرامبوونیدا؛ ئەوا عوزرە و پاساوە و هیچ کاریگەری لەسەر حەج و عومرەکەیان نابێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ [البقرة : ٢٨٦]. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ۝٥﴾ [الأحزاب : ٥].

بەڵام ئەگەر زانا بوون بەسەر حەرامبوونیدا، بەڵام نەزان بوون بەسەر ئەو هەموو ئەنجامی سەرپێچییەدا کە بەسەریاندا دێت لەلایەن شەرعەوە؛ ئایا دەبێتە پاساو؟ وەڵام: نەخێر نابێتە پاساو و ئەو حوکمانە بەسەریاندا جێبەجێ دەکرێت.

س٩٦/ چوونە لای خێزانی لە مەراسیمی عومرەکردندا [(١)].

ج/ بە لەبەرکردنی ئیحرام هیچ شتێکی لەسەر حەرام نابێت، تاوەکوو نیەت نەهێنێت، وە ئەگەر نیەتی هێنا، بە دڵ و بە دەمیش (تلبیة)ی کرد؛ ئەوا دەچێتە ناو مەراسیمی عومرەوە، ئەگەر لە پاش ئەم حاڵەتە چووە لای خێزانی بە تەواوی ئەوا ئیحرامەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، وە گەر تەواف و سەعی سەفا و مەروەی ئەنجامدابوو، بەڵام هێشتا سەری نەتاشیبوو، یان کورتی نەکردبووەوە، چووە لای خێزانی، ئەوا لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئیحرام و عومرەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و دەبێت حەیوانێك لە مەککەدا سەر ببڕێت و بیدات بە هەژاران و بچێت بۆ نزیکترین میقات وەکوو (تنعیم)، گەر لەناو مەککەدا بوو لەوێوە و سەرلەنوێ خۆیی و خێزانی ئیحرام ببەستنەوە، وە عومرەکە سەرلەنوێ بکەنەوە، ئەم حوکمە هەردووکیان (ژن و پیاو) دەگرێتەوە.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٥٩٥، ٦٦٩ (٢٢/ ١١٧، ١٦٩).

## سەرتـاشين و كورتكردنەوە

س ٩٧ / حاجييەك هەندێك لە قژی كورت كردووەتەوە بە نەزانين و پاشان بەرگی ئيحرامی لابردووە و جلەكانی خۆی لەبەر كردووە؟[١].

ج / ئەو حاجييەی بە نەزانين هەندێ لە قژی كورت كردووەتەوە و جلی خۆی لەبەركردووە، هيچی لەسەر نييە، لەبەرئەوەی نەزان بووە، بەڵام ئەوەی كە لەسەری ماوە كورتكردنەوەی پاشماوەی و تەواوی سەريەتی.

س ٩٨ / كەسێك كە (أصلع) بێت و هيچ موويەك بەسەريەوە نەڕوێت، چی بكات لەكاتی سەرتاشيندا، ئايا مووس بەسەريدا بهێنێت؟[٢].

ج / هيچی لەسەر نييە و پێويست بەوە ناكات مووس بێنێت بەسەريدا، گەرچی ڕايەكی لەسەرە، بەڵام ئەو ڕايە ڕاست نييە، وەكوو ئەو ڕايە وايە كە دەڵێن دەبێت (لاڵ) لە نوێژدا دەم و لێوی

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٥٩٧ (٢٢/ ١١٩).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ١١٩٢ (٢٣/ ١٥٩).

بجوولێنێت.

س ٩٩/ قژ كورتكردنەوەی ئافرەت؟ [١].

ج/ ئەگەر پەلكەی هەبوو ئەوا لە پەلكەكانی كورتی دەكاتەوە، گەر پەلكەی نەبوو ئەوا لە هەموو لایەكی قژی ڕاست و چەپ و پشتەوە بە ڕێژەی سەرە نینۆكێك دەبڕێت.

س ١٠٠ / كەسێك سەری بتاشێت بۆ عومرە، كاتی حەج بۆ سەرتاشین چی بكات؟ [٢].

ج/ بەسیەتی كە مووس بەسەریدا بهێنێت، لەبەرئەوەی موو كەمێك هەر دەڕوێت.

س ١٠١/ هەڵەكانی سەرتاشین یان كورتكردنەوە؟ [٣].

ج / یەكەم: خەڵكانێك لایەك لە سەریان دەتاشن بە مووس بۆ عومرەیەك و لایەكەی تریشی بۆ عومرەیەكی تر.

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ١٠٢٩ (٢٢/ ٤٨٢).
(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٩٨، ١١٩١ (٢٣/ ١٥٨)، (٢٢/ ٤٦٤).
(٣) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٨٥ (٢٢/ ٤٥٤).

دووەم: خەڵكانێك چەند تەڵە موويەك دەبڕن لە لایەكی سەریان، یا چەند شوێنێك، ئەوە پێچەوانەی ئایەتەكەیە كە خوای گەورە ﷻ دەفەرمووێت: ﴿مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ﴾ [الفتح: ٢٧]. بە (كۆ و هەموو) ناوی سەری بردووە.

سێیەم: گەر سەرتاشی دەستنەكەوت، ئیحرام لادەبات و جل و بەرگی خۆی لەبەردەكات بەبێ كورتكردنەوە یا تاشینی سەر، لە كاتێكدا پێویستە بە ئیحرامەوە بمێنێتەوە تا سەری كورت دەكاتەوە یا دەیتاشێ، وە گەر زانی بەو كارە هەڵەیە؛ دەبێت جل و بەرگەكەی لاببات و ئیحرام بپۆشێت، تاوەكوو قژی كورت دەكاتەوە یا دەیتاشێت.

س ١٠٢/ كەسێك حەجی (التمتع) دەكات و لە عومرەكەیدا قژی كورت ناكاتەوە و نایتاشێت، پاشان حەجەكەشی دەكات، چی لەسەرە[1].

ج/ كورتكردنەوە یەكێكە لە واجبەكانی عومرە، وە بە نەكردنی واجبێك لای زانایان دەبێت حەیوانێك سەرببڕێت لە مەككەدا و

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٩٥ (٢٢/ ٤٦٣).

بيدات بە هەژاران، وە گەر لە دەرەوەی مەككە بێت دەبێت يەكێك ڕاسپێرێت كە حەيوانێكی بۆ سەرببڕێت لە مەككەدا.

س ١٠٣ / كەسێك سەرتاشينی عومرەكەی لە وڵاتی خۆی دەكات؟[1].

ج / گەر دوای عومرەكەی ڕاستەوخۆ گەڕايەوە بۆ وڵاتەكەی، دەبێت كاتێك زانی جل و بەرگی لاببات و ئيحرام بپۆشێت، پاشان سەری كورت بكاتەوە يان بيتاشێت (ئەگەر لەبيری چوو يان نەيزانيبێت)، وە گەر ڕێگرييەكانی ئيحراميشی ئەنجام دابێت هيچی لەسەر نييە، وە گەر ئافرەت بێت ئەوا هەر بەرگی خۆيەتی و بەس قژی دەبڕێت، ئەگەر ماوەی زۆر نەكەوتە نێوانيان، وە گەر نا فيديە دەدات.

س ١٠٤ / پياوێك عومرە دەكات و لەبيری دەچێت سەر بتاشێت و لە مەككە دەردەچێت و لە ڕێگادا بيری دەكەوێتەوە، جلەكانی دادەكەنێت و سەری دەتاشێت؟ [2].

ج/ داوام وايە هيچی لەسەر نەبێت.

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٩٩٧، ١٠٠١ (٢٢/ ٤٦٤، ٤٦٧).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ١٠٠٣ (٢٢/ ٤٦٨).

س ١٠٥ / خۆم و خێزانەکەم چووین بۆ عومرە و سەرم نەتاشی و قژی کورت نەکردەوە، بە گومانی ئەوەی سەرتاشین تایبەتە بە حەج، بەسەر ئەمەدا ماوەیەك تێپەڕی، ئایا چیمان لەسەرە؟ [١].

ج / هەریەك لە ئێوە دەبێت حەیوانێکی بۆ سەرببڕدرێت لە مەککەدا و بدرێت بە هەژاران.

س ١٠٦ / کەسێك سەری لەدوای عومرەکردن ناتاشێت، لە مەککەدا بیری دەکەوێتەوە، پاشان سەفەر دەکات بۆ وڵاتەکەی، حوکمی عومرەکەی چییە؟ [٢].

ج / عومرەکەی دروستە، بەڵام سەرتاشین یان کورتکردنەوەی لەسەر ماوە، هەندێك لە زانایان دەڵێن جلەکانی دادەکەنێت و ئیحرام لەبەر دەکات و پاشان سەری دەتاشێت یان کورتی دەکاتەوە، وە هەندێکیان دەڵێن بە دەرچوونی لە مەککە واجبە لەسەری کە حەیوانێك سەرببڕێت لە مەککەدا و بیدات بە هەژاران، منیش ئەم ڕایەی کۆتایی بە باش دەزانم، حەیوانێك سەرببڕێت لە مەککەدا و

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ١٠٠٦ (٢٢/ ٤٦٩).
(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ١٠٠٩ (٢٢/ ٤٧٠).

بيدات بە هەژاران.

س ١٠٧ / ئافرەتێك لەگەڵ منداڵێكى بچووكيدا عومرە دەكات، بەڵام قژى منداڵەكەى كورت ناكاتەوە، حوكمى چييە؟ [(١)].

ج / ئەوەى بۆم دەردەكەوێت ئەوەيە كە هيچ ياسايەكى حەج نايگرێتەوە، لەبەرئەوەى (مكلف) نييە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: ... وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَحْتَلِمَ ...»[(٢)]، واتە: قەڵەم هەڵگیراوە لەسەر سێ كەس: ... لەسەر منداڵ تاوەكوو بالغ دەبێت، گەر حەرامێكى ئيحرامى كرد، يا واجبێكى نەكرد؛ هيچى لەسەر نييە، وە گەر ئيحراميش لاببات و عومرەكەى نەكات.

## لەدواى عومرەكردن گەڕانەوە بۆ ميقات حەجى تەنيا (الافراد) دەكرێت

س ١٠٨ / پياوێك لە ئەفريقاوە هاتووە و عومرەى كردووە لە مانگەكانى حەجدا، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ مەدينە، ئايا بە حەجى

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ١٠١٢ (٢٢/ ٤٧٢).

(٢) رواه أبو داود (٤٣٩٨)، والترمذي (١٤٢٣)، وأحمد في "المسند" (٣٤٧٣٨)، والدارمي في "سننه" (٢٣٤٢)، وغيرهم، وصححه الألباني في "المشكاة" (٣٢٨٧).

(متمتع) دادەنرێت؟ [(١)].

ج / ... (والصحيح) ڕای دروست ئەوەیە کە بە حەجی (مفرد) دانانرێت، بەڵکوو هەر (متمتع)ە، لەبەرئەوەی ئەو سەفەرەی کە لە (تمتع) پێی دەردەچێت ئەو سەفەرەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، لەبەرئەوەی سەفەر لە مەککەوە بۆ مەدینە، وە لە مەدینەوە بۆ مەککە بە سەفەرێك دادەنرێت، گەر لە مەدینەوە بە عومرەی تازە یا حەج ئیحرامی بەست؛ هەر لە (تمتع) دەرناچێت و واجبە حەیوان سەر ببڕێت بۆ حەجی (تمتع)ەکەی.

## سەربڕینی ئاژەڵ

س ١٠٩ / ئایا دروستە سەربڕینی ئاژەڵ بۆ حەجی (التمتع، القران) لە دەرەوەی حەرەم؟ [(٢)].

ج / واجبە سەربڕینی ئاژەڵ لە مەراسیمی حەجدا (تمتع وقران وفدية) لە سنووری حەرەمدا بێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ ٣٣﴾[الحج:٣٣]. هەرکەسێك لەدەرەوەی

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٥٦٣ (٢٢/ ٨٣).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧٣٨ (٢٢/ ٢٢٦).

حەرەم سەری ببڕێت؛ دەبێت سەرلەنوێ سەری ببڕێتەوە لە سنووری حەرەمدا.

س ١١٠ / ئەگەر حاجی سەربڕینی حەیوان (فدیە)ی بیرچوو، چی بكات؟ [(١)].

ج / دەبێت لە حەرەمدا سەری ببڕێت، یان وەكیلێك بگرێت بۆی سەربڕێت لە مەككەدا، نابێت لە دەرەوەی حەرەم سەری ببڕێت.

س ١١١ / ئەگەر لەسەر نەكردنی واجبێك نەیبوو حەیوان سەر ببڕێت، چی بكات؟ [(٢)].

ج / واجبە لەسەر نەكردنی واجبێك یان كردنی حەرام و ڕێگرییەكی ئیحرام حەیوانێك سەر ببڕێت، لە سنووری حەرەمی مەككەدا، لە شوێنی تر دروست نییە، وە ئەگەر توانای نەبوو ئەو حەیوانی (فدیة)یە سەربڕێت؛ ئەوا هیچی لەسەر نییە و دروست نییە قیاس بكرێتە سەر قوربانی حاجی حەجی (التمتع والقران)، لەبەر جیاوازی زۆر لە نێوانیاندا، ئەوەیان (فدیة) پڕبوونەوەی ناتەواوی

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧٣٦ (٢٢/ ٢٢٥).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧٣٣ (٢٢/ ٢٢٣).

حەجە و ئەمەیان قوربانی و شوكرانەی خوایە.

## باشترین جۆرەكانی حەج

س ١١٢/ باشترین جۆرەكانی حەج كامیانە؟ [١].

ج/ باشترین جۆرەكانی حەج (التمتع)ە، ئەوەیە كە حاجی لەپێشدا عومرە دەكات و پاشان ئیحرام بۆ حەج دەبەستێت، بەڵگەمان پێغەمبەری خوایە ﷺ كە فەرمانی بە هاوەڵانی دا بەو شێوەیە و فەرمووی: «لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا أَهْدَيْتُ، وَلَوْلاَ أَنَّ مَعِي الْهَدْيَ لَأَحْلَلْتُ»[٢].

واتە: ئەگەر ئەم كارەم بهاتایەتە ڕێ (واتە لەبیرم بوایە تمتع)، پشتم تێنەدەكرد و حەیوانم لە مەدینەوە نەدەهێنا بۆ قوربانی و عومرەم دەكرد لەگەڵتان، كەواتە لەبەر هێنانی حەیوان بۆ قوربانی نەیتوانی بیكات بە (تمتع)، لەبەرئەوە ئەوەی حەیوانی پێبێت دەبێت بە (قران) بیكات.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٥٠٩ (٢٢/ ٤٣)، و (٢٤/ ٢٦٥).

(٢) رواه البخاري (١٦٥١)، ومسلم (١٢١١).

## وشەی حەرەم

س١١٣/ ئایا وشەی حەرەم بەکار دەهێنرێت بۆ (قُدسْ)؟ [1].

ج / (المسجد الأقصى، قدس) پێی ناوترێت حەرەمی سێیەم، لەبەرئەوەی سنووری حەرەمی نییە، سنووری حەرەم بۆ مەککە و مەدینە هەیە بە گوێرەی دەقەکان.

## شوێنگرتن بۆ کاتی نوێژ

س ١١٤ / حوکمی شوێنگرتن لە حەرەمی مەککەدا بۆ نوێژکردن؟[2].

ج / ئەوەی هەندێك لە خەڵکی دەیکەن، شوێن دەگرن دەڕۆن بۆ ماڵەوە یان بۆ نان خواردن یان کڕین و فرۆشتن؛ ئەو کارە حەرامە و دروست نییە.

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧٥٦ (٢٢/ ٢٣٩).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ١٥٥٥ (٢٤/ ٤١).

## تاوان لە مەککەدا چەندەها قاتە

س ١١٥ / ئایا تاوانیش لە مەککەدا چەندەها قاتە؟ (١).

ج / تاوان لە مەککەدا لەڕووی چۆنێتییەوەیە، نەك چەندێتی، بەو مانایەی سزای توند و سەختی بۆ هەیە، لەبەرئەوەی خوای گەورە ﷻ دەفەرموێت: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ١٦٠﴾ [الأنعام : ١٦٠].

واتە: هەرکەسێك چاکەیەك بکات بە دە هێندەیە، وە ئەوەی خراپەیەك بکات بە هاوشێوەی خۆیەتی.

وە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ٢٥﴾ [الحج : ٢٥].

واتە: سزا لە مەککەدا توندترە تا لە دەرەوەی مەککە، ئەمە ئاگادارکردنەوەیەکی توندە لەسەر تاوان لە مەککەدا.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" (٢٠/١٦٩).

## حوكمی جگەرە خواردن لە ئیحرامدا

س ١١٦ / حوكمی جگەرە خواردن لەكاتی ئیحرام پۆشینی عومرەدا بەر (فسوق) دەكەوێت، كە خوای گەورە ڕێگری لێ كردووە و دەفەرموێت: ﴿فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ﴾ [البَقَرَة : ١٩٧]؟ [1].

ج / بەڵێ بەر ئەو تاوانانە دەكەوێت كە پێی دەوترێت (فسوق) و فەرمانەكەی خوای جێبەجێ نەكردووە، وە هەروەها كەسێك گیرۆدەی كەسانێك بوو لەو ڕێگەیەدا كە باس و غەیبەتی خەڵكیان دەكرد؛ ئەوا دەبێت هاوڕێیەتییان نەكات، مەگەر بتوانێت ڕێگرییان لێبكات.

## حەجكردن لە ماڵێك كە زەكاتی لێنەدراوە

س ١١٧ / حەجكردن لە پارە و ماڵێك كە زەكاتی لێنەدرابێت؟ [2].

ج / حەجەكە دروستە، بەڵام شوێنی سەرسامییە كە زەكات نادات و حەج دەكات، وە لەوە زیاتر كەسێك نوێژ ناكات و حەج دەكات، ئەوەی نوێژ نەكات دەڵێم: دروست نییە و نابێت بێتە ناو مەككەوە و

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ١٦٠٧ (٢٤/ ٧٤).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٨٥ (٢١/ ٨٢).

حەج و خێر و هیچ کردەوەیەکی چاکی لێ وەرناگیرێت.

## دواخستنی حەج بۆ دوای ژنهێنان

س١١٨/ ئایا دروستە حەج دوابخەیت بۆ دوای ژنهێنان؟ [١].

ج/ لە مەرجەکانی حەج ژنهێنان نییە، بەڵام گەر حەج بکات و پارەی پێ نەمێنێت بۆ ژنهێنانەکەی؛ لەم حاڵەتەدا دەبێت ژنهێنانەکەی پێشبخات، لەبەرئەوەی بۆ ئەم لە پێویستیاتێکی ژیانە، بەڵام حەج لەکاتی تواناداریدا دەبێت.

## کاری حەملەداری و (إعلانات) بۆی

س١١٩/ ڕێنموونیتان بۆ حەملەداران؟ [٢].

ج/ حەملەدار ئەمینە و ڕێنموونیکاری حاجییانە، واجبە لەسەریان لە خوا بترسن لە ڕێنموونی حاجییاندا، لەبەرئەوەی خوای گەورە ﷻ ئەوانی کردووە بە سەرپەرشتیکاریان بۆ جێبەجێکردن و ئەنجامدانی حەج و عومرە، بە شێوەی شەرعی خۆی کە لە سوننەتدا هاتووە

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ٧١ (٢١/ ٧٣).

(٢) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ١٦٢٠، ١٦٢١ (٢٤/ ٨٣).

بەگوێرەی توانا، وە ئەوەی کە لەسەریەتی جێبەجێی بکات، دەبینین هەندێك لەوان کەمتەرخەمن و زیان بە حەجی حاجییان دەگەیەنن، ئەوە ستەم و هەڵەیەکی گەورەیە و لێپرساوە بەرامبەر خوا ﷻ، با لە خوا بترسێت و لێپرسینەوەی خۆی بکات لە دونیادا پێش ڕۆژی دوایی.

س ١٢٠ / حوکمی هەڵواسینی (ڕیکلام) بۆ حەج و عومرە لە مزگەوتەکاندا؟ [1].

ج / دروست نییە هەڵواسینی (ڕیکلام) بۆ حەج و عومرە لەناو مزگەوتەکاندا، لەبەرئەوەی زۆری ئەوانە مەبەستیان پێی بەدەستهێنانی پارە وماڵە، ئەوە جۆرێکە لە بازرگانی، کە ڕێگری کراوە لە مزگەوتدا بکرێت، وە گەر لەسەر دەرگای دەرەوەی مزگەوت بێت باشترە.

---

(١) "مجموع فتاوى ورسائل العثيمين" السؤال رقم ١٦٢٧ (٢٤/ ٩٠).

# نـــاوەڕۆك

**بابەت** **لاپەڕە**